زنجیرەی بیداری (٥)



# لە کوێ هاتیت
# بۆچی هاتیت
# بۆ کوێ دەچیت



محەمەد سالح پێندرۆیی
(چگەرسۆز)

٢٠١٨



## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: لە کوێ هاتیت؟ بۆچی هاتیت؟ بۆ کوێ دەچیت؟

نووسینی: محەمەدسالح پێندرۆیی (جگەرسۆز)

هەڵەگری و پێداچوونەوە: نووسەر

دەرهێنانی هونەری: یعقوب قادر پیرۆت

بەرگ: پشتیوان عەبدولرەحمان

نۆرەی چاپ: یەکەم

تیراژ:( ١٠٠٠) دانە

ساڵی چاپ: ٢٠١٨

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردن(٧٠١)ی ساڵی(٢٠١٨)ی پێدراوە

ئەم کتێبە لەسەر ئەرکی خێرخوازێك چاپکراوە و بۆ فرۆشتنەوە نییە.

# ناوەڕۆک

## دەستپێک

## بە ناوی خودای مەزن و دلۆڤان

بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، تاکو ئێستا،هەمیشە ئەم سێ پرسیارە گرنگ و هەســتیارەلە گوێی مرۆڤدا زرینگاوەتەوە: تۆ لە کوێ هاتیت؟ بۆچی هاتیت؟ بۆ کوێ دەچیت؟ واتە:مرۆڤ لە خۆی پرسیوە: لە کوێ هاتوومەتە ئەم دنیایە؟ بۆچی هاتوومەتە ئەم دنیایە؟ چارەنووســیشــملە دوای مردن،چیلێدێت و چی بەسەردێت؟!

هەڵبەت، هەمیشە فەیلەسوفان و بیرمەندان و زانایان بە دوای وەڵامی ئەو ســێ پرســیارەدا گەڕاون، بۆیە زۆرێك لەو زانا و فەیلەســوف و بیرمەندانە لە ڕێگەی پەرتووکە ئاسمانییەکانەوە، واتە، وەحی ئاسمانییەوە، وەڵامی ئەو ســێ پرســیارەیان دەســتکەوتووە، بەڵام ئەو کەســانەی کە لە دەرەوەی ئەو بازنەیەن، واتە،لە دەرەوەی بازنەی ئایینە ئاســمانییەکان بیریان کردۆتەوەو باوەڕیان بە هیچ ئایینێکی ئاســـمانی نییە و نەبووە، هیچ وەڵامێکی یەکلاکەرەوە و قانعکەریان دەســتنەکەوتوو، بۆیە بەشــێکیان بە سەرگەردانی و سەرلێشێواوی سەریان ناوەتەوە، بەشێکیشیان هێشتا بەدوای وەڵامەکەیدا وێڵ و سەرگەردانن!

بەندە،لەم پەرتووکەدا،بە پشــت بەســتن بە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان، هەروەهالە ڕێگەی بەڵگە عەقڵییەکانەوە، هەوڵمداوەبە تێر و تەســەلی وەڵامی ئەو سێ پرسیارە بدەمەوە.

من دڵنیام تا مرۆڤ نەتوانێ خۆی بناسێت، ناتوانێ بە تەواویخودای خۆیشی بناسێت، بۆیە سەرەتا دەبێت لە خۆیەوە دەستپێبکات و بیر لە دروستبوونی خۆی و بوونەوەرەکانی دیکە بکاتەوە و لەم گەردوون و بوونەوەرە فرە رەنگ و جۆراوجۆرە رامێنێت، ئینجا دەتوانێ پەی بە پەروەردگاری خۆی ببات و بە چاکی بیناسێت و کڕنۆشی بۆ ببات و بیپەرستێت.

لە کۆتاییدا هیوادارم شیابم خاڵ لەسەر پیتەکان دابنێم و ئامانجەکەم پێکابێت، کە بریتییە لە هاندانی مرۆڤ بەرەوخۆناسین وخوداناسین،تاکو لە شیرك و ئیلحاد و بێ باوەڕی دووربکەوێتەوەو، لە کەسێکی بێباوەڕەوە، ببێتە کەسێکی باوەڕدارو،لە کەسێکی بەدگومانەوە ببێتە کەسێکی یەقیندار،لە کەسێکی خۆپەرستەوە، ببێتە کەسێکیخواداپەرست.

ومن الله التوفیق.


محەمەدساڵح پێندرۆیی(جگەرسۆز)

ساڵی ٢٠١٨

تەلەفۆن/ ٠٧٥٠٤٤٨٥٨٩١

ئیمەیل(Muhammad.s.pendroi@gmail.com)

# پلەو پایەی مرۆڤ لای خودا

خودای مەزن و دلۆڤان، ڕێزێکی زۆری لە مرۆڤ ناوەو زۆرپلەیبەرزی پێبەخشیوە، کە بە هیچ بوونەوەرێکی دیکەی نەبەخشیوە، کە لەم چەند خاڵەدا چڕ دەکەینەوە:

## ١. خودا،مرۆڤی بە جوانترین و باشترین شێوەدروستکردووە:

خودای میهرەبان و باڵادەست، جەستەو لەشی مرۆڤی بە جوانترین و باشترین شێوەئافراندووە، تەنانەت ئەندازە (هەندەسە)ی لەشی مرۆڤی زۆر سەرسوڕهێنەرو ڕێکوپێك و وردە، بەشێوەیەك، مرۆڤ لە ئاستیدا حەیران و سەرگەردان و دەستەوەستانە.

بۆیەخودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا، ئاماژە بەم فەزڵە دەكات، کە بە مرۆڤی بەخشیوە،هەر وەك لە سورەتی(التين)دا دەفەرموێ:﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾

واتە: "بەڕاستیی ئێمە ئینسانمانلە هەموو ڕوویەکەوە، لە جوانترین شێوەو ڕێکوپێکترین شێوازدا دروستکردووە ".

هەروەها لە سورەتی (التغابن)دا دەفەرموێ:﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ ﴾

واتە:"ئەوخودایە، لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی، ئاسمانەکان و زەویی دروستکردووە، وێنەیڕوخساری ئێوەشی بەجوانترین شێوەکێشاوە، گەڕانەوەو سەرەنجامیش هەر بۆ لای ئەوە".

هەروەها لە سورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ:﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ ﴿١١﴾ ﴾

واتە:"سوێند بەخوا، بەڕاستیی ئێمە باوە گەورەی ئێوەمان دروستکردو نەخش و نیگاری (ڕواڵەت و ڕوخسار)ی ئێوەمان کێشا، پاشان وتمان بە فریشتەکان: ئادەمیە فەرمانیخودا، کڕنۆش بەرن بۆ ئادەم، کڕنۆشیڕێز، جا هەموو فریشتەکانکڕنۆشیان برد، جگە لە ئیبلیس نەبێت،کە فەرمانی خودای شکاندو، لە کڕنۆشبەران نەبوو".

## ٢. خودا، لە ڕۆحی خۆی کردووە بە جەستەی مرۆڤدا:

دوای ئەوەیخودای مەزن،جەستەی مرۆڤی لە گڵ (خۆڵ) دروستکرد، لە ڕۆحی خۆی، گیانی کرد بە بەریدا و، بەو ڕێگەیە پلەیەکی دیکەی بەرزکردەوە.

هەروەك لە سورەتی(ص)دا فەرموێ:﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾

واتە،کێشەی فریشتەکان کاتێك بوو، کە پەروەردگارت پێی وتن: من دەمەوێت بەشەرێک، لە قوڕ دروست بکەم.

جا كاتێك دروســـتم كرد و لەو گیان و ڕۆحەی كە من خاوەنی ئەوم، فووم پێداكردو گیـان و ژیانم پێبەخشـــی، ئێوەی فریشـــتە هەمووتان بەفەرمانی من،كڕنۆشیرێزو تەقدیریبۆ بەرن.

هەروەها لە سورەتی (التحريم)دا دەفەرموێ:﴿ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾ ﴾.

واتە:"هەروەها نموونەی هێناوەتەوە بە مەریەمی كچی عیمرانیش، كە داوێنی خۆی بەپاكیڕاگرت، ئێمەش لەو ڕۆحەی كە بەدەســـتمانە، فوومان پێداكرد، ئەویش باوەڕی تەواوی هەبوو بە گوفتارو فەرمانەكانی پەروەردگاری و هەمیشـــەو بەردەوام ملكەچ و فەرمانبەرداروخوداناس و نزاكار بوو".

## ٣. خودا، ڕێزێكی زۆری لە مرۆڤ ناوە:

خوا، بە لوتف و میهرەبانی خۆی،قەدرو ڕێزێكی زۆری لە مرۆڤ ناوەو پلەو پایەی مرۆڤی لە باقی بوونەوەرەكانی دیكە بەرزتر كردۆتەوە.

هەروەك لە سورەتی(الإسراء)دا دەفەرموێ:﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾

واتە:"سوێند بەخودا، بەڕاستیی ئێمەڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووەو بەسەر وشکانی و دەریادا، بە جۆرەها هۆکاری گواستنەوە، هەڵمان گرتوون و لە رزق و ڕۆزیی پوخت و چاکی جۆراو جۆر بەهرەوەرمان کردوون، لە خۆراك و پۆشاك و ماڵ و ناوماڵ و .. هتد. بەڕاستیی ئێمهلە هەموو ڕوویەکەوە،ڕێزی زیادەی ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی ئەو بەدیهێنراوانەدا،کە دروستمان کردوون، تا قەدرو ڕێزی خۆیان بزانن".

## ٤. خودا، قورئانی پیرۆزی بۆ مرۆڤ ناردووە:

قورئانی پیرۆز، کەلامی پەروەردگارو کۆتا پەرتووکی ئاسمانییە، کەبۆ مرۆڤ نێردراوە، هەروەها گەورەترین(موعجیزە)شە، چونکە پڕە لە حیکمەت و زانست و دەستوور و یاساو نهێنییەکانی ئاسمان و زەوی و دەریاکان و چیرۆك و بەسەرهاتی نەتەوە و ئایینەکانی ڕابردوو.

هەروەها تەحەدداشی تێدایە بۆ مرۆڤەکان، کەتا ئەبەد ناتوانن سورەتێکی وەك قورئان بێنن، ئەگەرچی هەندێکیان هاوکاریی هەندێکیان بن.

هەڵبەت، یەکێك لە موعجیزەکانی قورئانی پیرۆز ئەوەیە،کەس ناتوانێ هیچ شتێکی لێ کەم وزیاد بکات، چونکەخودای گەورە بەڵێنی داوە،تا ڕۆژی قیامەتلە فەوتان و دەستکاریکردن بپارێزێت!

دابەزینی ئەم قورئانە مەزنە لە ئاسمانەوە، بۆ سەر مرۆڤەکان،بەڵگەیە لەسەرئەو ڕاستییە، کەخودابە چاوێکی مەزن سەیری مرۆڤی کردووە،بۆیە ئەم کتێبە بە قەدرو ڕێزەی بۆ ناردۆتەخودارەوەو کردووە بە دەستوور و یاسا

و چرای ژیانی، تاکوژیانی خۆیبه گومڕایی و وێلی و سەرگەردانی نەباتەسەر و نەکەوێتە تەڵەی نەفس و شەیتانەوە.

هەروەك لە چەندین ئایەتدا ئاماژە بەم ڕاستییە حاشاهەڵنەگرە دەکات، لەوانە:

- لە سورەتی (یوسف)دا، دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ۝٢﴾.

واتە"بەڕاستیی ئێمە قورئانێکمان بە عەرەبی ناردۆتە خوارەوە، بۆ ئەوەی ژیربن و لێی تێبگەن".

- دیسان لە سورەتی (یوسف)دا، دەفەرموێ: ﴿نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ۝٣﴾

واتە: "ئەی محەمەد(ﷺ)، ئێمە چاکترین و جوانترین چیرۆك و بەسەرهاتت بۆ دەگێڕینەوە، بەهۆی ئەم قورئانەی کە نیگامان کرد بۆ لای تۆ، لەکاتێکدا، بێگومان تۆ لە پێش ئەم قورئانە، لەم بەسەرهاتە بێئاگابوویت".

- لە سورەتی(إبراهیم)دا، دەفەرموێ: ﴿الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ۝١﴾

واتە:"بە(ئەلیف، لام، ڕا) دەخوێنرێتەوە،ئەی محەمەد(ﷺ)، ئەمە کتێبێکە،بۆ تۆمان ناردۆتەخوادرەوە، بۆ ئەوەی خەڵکیڕزگار بکەیت لەتاریکییەکانەوە بۆڕووناکی، بە ئیزنی پەروەردگاریان، ڕێنموونییان بکەیت، بۆڕێگایخودای بەدەسەڵات و زاڵی سوپاسکراو".

▪ لە سورەتی (القدر)دا دەفەرموێ:﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ۝١ ﴾

واتە:"بەڕاستیی ئێمە لە شەوێکی زۆر پیرۆزو بەڕێزدا، قورئانمان دابەزاند.

بەڵێ بەڕاستیی ئەو شەوە زۆر بەڕێزە، چونکە قورئانی تێدا هاتووە، جا دەبێ چ پلەیەك لەوە گەورەتربێ، کەخودای گەورە بەو شەوەی بەخشیوە"؟

▪ لە سورەتی (الدخان)دا دەفەرموێ:﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ۝٣ ﴾

واتە:"بەڕاستیی ئێمە ئەم قورئانەمان لە شەوێکی پیرۆزدا ناردۆتەخوادرەوە، بێگومان ئێمە ترسێنەرین".

▪ لە سورەتی (آل عمران)دا، دەفەرموێ:﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ وَمَا يَعۡلَمُ

تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٧﴾

واته:"ئەی محەمەد(ﷺ)، ئەو خوایە زاتێکە، کە قورئانی بۆ سەر تۆنارده خوارەوە، بەشێک لە ئایەتەکانی دامەزراو و پایەدارورِوون و ئاشکران، ئەوانە بنچینەو بناغەی قورئانەکەن، هەروەها هەندێکی تریشی، واتای جۆراوجۆر هەڵدەگرن و بە ئاسانی نازانرێن، جا ئەوانەی کە لاری و لادانلە دڵیاندا هەیە، حەز لە حەق و ڕاستی ناکەن، ئەوانە شوێنی ئەو ئایەتانە دەکەون کە مانای جۆراو جۆر و فراوانیان هەیە، بۆ ئەوەی فیتنە و ئاشوب و ناکۆکی و دووبەرەکی دروست بکەن، یان بۆ ئەوەی لێکدانەوەی هەڵەی بۆ هەڵبەستن، لە حاڵێکدا، کە لێکدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە هەر خودا خۆی بە تەواوی دەیزانێت، جا ئەو کەسانەی کەلە زانستدا ڕۆچوون، دەڵێن: ئێمە باوەڕی دامەزراومان بەهەر هەموونەو ئایەتانەهەیە، کە لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە و فەرمایشی ئەوە،لەڕاستیدا، جگە لە خاوەن بیر و ژیرەکان،یاداوەری وەرناگرن و بیرلەم قورئانەناکەنەوە".

- لە سورەتی (الشعراء)دا، دەفەرموێ:﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ ﴾.

واته:"بەڕاستیی ئەم قورئانە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە".

■ لە سورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾﴾

واتە: "کافرەکان، بیانوویەکی تریان گرت و وتیان: ئەوە بۆ قورئان بە یەک کەرەت بۆی ڕەوانە ناکرێت؟ بێگومان ئێمە هەر بەو شێوەیە ڕەوانەی دەکەین، تا دڵی تۆ زیاتر دڵنیا بکەین، بەردەوام بەجوانی دایدەڕێژین و دەیگەیەنین".

■ لە سورەتی (التوبة)دا، دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾﴾

واتە: "کاتێکیش سورەتێک لە قورئان دابەزێنرا، هەندێک لە دووڕووەکان، بەگاڵتە پێکردنەوە دەڵێن: باوەڕیکامتان بەم سورەتە زێدەبووە؟! جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێنا بوو، ئەوەندەی تر ئیمان و باوەڕی پتەو تر کردن، ئەوانیش مژدە بەیەکتر دەدەن، دەربارەی سەرکەوتن و خۆشیی هەردوو جیهان).

■ لە سورەتی (الأنبیاء)دا، دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠﴾﴾.

واتە: "سوێند بەخودا، کتێبێکمان بۆ ئێوە ناردۆتە خوارەوە، کە سەربەرزی و ناوبانگی ئێوەی تێدایە، دەی ئایا بۆ بیرناکەنەوە"؟!

## ٥. خودا، مرۆڤی کردووه به جێنشینی خۆی لەسەر زەوی:

پلەیەکی دیکە، لەو پلە بەرزانەی کەخودالەم دنیایەدا،بە مرۆڤی بەخشـــیوە، پلەی جێنشـــینییە، واتە:خودا بە گەورەیی خۆی، مرۆڤی هەڵبژاردووە،بۆ ئەوەی لە سەر زەویی ببێتە جێنشینی ئەو زاتە، تاکو زەوی ئاوەدان بکاتەوە و جوانی بە ژیان ببەخشێت.

بۆ ســـەلماندنی ئەم ڕاســـتییە، چەند بەڵگەیەك لە قورئانی پیرۆز دەخەینە ڕوو:

- خوای مەزن لەسورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ:﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾

واتە:"بیریان بێنەوە، کاتێک کە پەروەردگاری تۆ، بە فریشـــتەکانی وت: بەڕاستیی من جێنشینێک دروست دەکەم لەسەر زەوی، فریشتەکان وتیان: ئایا کەسێکی وای تیایدا دروست دەکەیت، کە خراپەو بەدییتێدا بکـات و خوێنی تێـدا بڕێژێـت؟ لـە کـاتێکـدا، کـە ئێمـەیـادت دەکەینبەسـتایشـکردنت، وە بەپاک ڕاتدەگرین،خودا فەرمووی:بێگومان ئەوەی من دەیزانم، ئێوە نایزانن".

■ لە سورەتی (هود)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾ ﴾

واتە: "بۆ هۆزی ئەمودیش، صالحی برایانمانڕەوانە کرد، وتی: ئەی خزمەکانم، گوێڕایەڵیخودای گەورە بکەن، جگە لەو زاتە، هیچخودایەکیدیکەتان نییە، ئەو بەرپای کردوون لە زەویداو داوای لێکردوون کە ئاوەدانی بکەنەوە، جا کەوابوو، داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای و فەرمانەکانی بەجێبهێنن، چونکە بەڕاستیی پەروەردگاری من، زۆر نزیکە و نزا وەرگرە، لەو کەسانەیکە لێی دەپاڕێنەوە و داوای لێخۆشبوونی لێدەکەن".

■ لە سورەتی (النور)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾

واتە: "خودا بەڵێنی دڵنیابەخش و تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، بە ڕاستیی لە ئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات لە وڵاتدا، هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووەو ئەو دین و

ئایینەیانبۆدەچەسـپێنێت،کەخودا خۆی پێیڕازییە، هەروەها ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێت بە ئارامی و هێمنی، ئەو کاتە ئیتر بە تەواوی هەر من دەپەرسـتن و هەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵ و شـەریکێکم بۆ بڕیار نادەن، ئەوسـا ئەوەی دوای ئەو پایەدارییە بێباوەڕ بێت، ئا ئەو جۆرە کەسـانە تاوانبارو لە سنوور دەرچوون".

■ لە سورەتی (ص)دا، دەفەرموێ: ﴿ يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾ ﴾

واتە: "ئەی داود: بەڕاسـتیی ئێمە تۆمان کردۆتە جێنشـین لەم وڵاتەدا، فەرمانڕەوایی لە نێوان خەڵکدا لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستیی ئەنجام بدە، هەرگیز شـوێنی ئارەزوو مەکەوە، تا نەبێتە هۆی گومڕاکردن و لادانت لە ڕێبازیخودا، چونکە بێگومان ئەوانەی لە ڕێبازیخودا لادەدەن، سزای بە ئێش و پڕ ئازار بۆیان ئامادەیە، بەهۆی فەرامۆشکردنیڕۆژی لێپرسینەوە".

● دیسان لە سورەتی(القصص)دا،دەفەرموێ: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾

واتە: "ئێمە دەمانەوێت پایەداریان بکەین ودەسـەڵاتیان بچەسـپێنین لە وڵاتداو، ئەوە پێش بهێنین بۆ فیرعەون و هامان و سـەربازانیان،

کەلێیدەترسـان،ئەم بەڵێنە خوداییە، بەویسـتی پەروەردگاری باڵدەسـت دووبارە دەبێتەوە بۆ ئیمانداران لە بارودۆخی تایبەت و گونجاودا".

● لە سورەتی (الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا ۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ ﴾

واتە:"دیارە قەومەکەیمووسا زۆر لە ناخۆشیدا بوون، بۆیە وتیان: پێش ئەوەی تۆ بێیتە ناومان و دوای ئەوەش کە هاتوویت، بارودۆخی ئێمە نەگۆڕاوە، هەر ئازاردراوبووین،مووسـا وتی: ئومێد وایە پەروەردگارتان دوژمنەکەتان لەناو ببات و بتانکاتە جێنشین لە زەویدا، ئەوسا سەیرتان دەکات، کە ئێوە چۆن کاردەکەن"!

● لە سورەتی (إبراهیم)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ ﴾
واتە:"بێگومان نیشـتەجێتان دەکەین لەو وڵاتەدا، لە دوای ئەوان، ئەوەش بۆ هەموو ئەو کەسـانەیە کە لە وەسـتانیان لە بەردەم دەسـەڵاتی مندا دەترسن و بیم و ترسیان لە هەڕەشەکانیمن هەیە".

● لە سورەتی(الاعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ۚ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ

بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾

واتە:"ئایا سەرتان سوڕماوە لە هاتنیسرووش(وەحی)و ئامۆژگاریی لە لایەن پەروەردگارتانەوە، بۆ پیاوێك لە خۆتان، تا بتانترسێنێ، وە بیری چاکەکانیخودا بکەنەوە، کاتێ ئێوەی کرد بەجێنشین، لەپاش گەلی نووح، وە لەش و قەڵافەتی ئێوەشی لەوان گەورەتر دروستکرد، کەواتە بیری چاکەو بەهرەکانیخودا بکەنەوە، بۆ ئەوەیرزگارتان ببێت".

■ لە سورەتی(الأعراف)دا،خودای دڵۆڤان دەفەرموێ:﴿ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًاۖ فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾.

واتە:"بیر بکەنەوە لەو کاتەی کەخودا ئێوەی گێڕا بە جێنشین، لە پاش هۆزی عاد، لە زەویدا دایمەزراندن و نیشتەجێی کردن لە دەشتەکانیدا، کۆشکی بەرز دروست دەکەن، وە لە شاخەکانیدا ماڵو خانوو دائەتاشن، دەبیربکەنەوە لە چاکە گەورەکانیخوداو خراپەکاری مەکەن لە وڵاتداو، مەبن بە خراپەکارو گێرەشێوێن".

■ لە سورەتی(النمل)دا،خوای مەزن دەفەرموێ:﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾.

واتە:"ئایا زاتێ کە دێت بە هاواری ناچارو داماوەوە کاتێ هاواری لێ دەکات، وە ناخۆشـــی و بەڵاکان لادەبات، وە دەتانکاتە جێنشـــینی گەلانی تری ســـەر زەوی، ئایا پەرســـتراوێکی تر هەیە لەگەڵخودادا؟! نەخێر نییە، بەڵام زۆر کەم بیردەکەنەوە".

● لە سورەتی(الأنعام)دا،خودای میهرەبان دەفەرموێ:﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾ ﴾

واتە:"خودا، هەر ئەو زاتەیە،کە ئێوەی کردووە بەجێنشـینی گەلانیڕابردوو لەم زەویەدا،هەروەها هەندێکتانلە ڕووی زانست، یان سامان یان هێزەوە،بە چەندەها پلە و پایە، بەســـــەر هەندێکیدیکەدا بەرز کردۆتەوە،بۆ ئەوەی تـاقیتـان بکـاتـەوە، بـەوەی کـە پێی بـەخشـــیوون، دڵنیـاش بـە، کـە پـەروەردگـاری تۆ، لـە تۆڵـەســـەنـدنـەوەدا خێرایـە، لـەوانـەی کـەلـە تاقیکردنەوەکەدا دەرناچن، بێگومان ئەو زاتە لێبوردە و میهرەبانیشـــە بۆ سەرفرازان".

● لە ســـورەتی(الحج)دا،خوا دەفەرموێ:﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾ ﴾

واتـە:"ئـەوانـەی کـە ئـەگـەر پـایـەدارمـان کردن لـە زەویـدا، نوێژ و دروشـــمەکانی بـەچاکیڕادەگرن، زەکـاتیش بـەتـەواوی دەدەن، فـەرمـان

بەچاکە دەکەن، قەدەغە لە خراپە دەکەن، ســـەرئەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە".

▪ لە ســورەتی(الأنعام)دا،خوای دلۆڤان دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا السَّمَاءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا الْأَنْهَارَ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ ﴿٦﴾ ﴾.

واتە:"ئایا نەیانبینیوە و نەیانزانیوە، بەهۆی شوێنەوارەوە، چەندەها نەوەمان پێش ئەمان لەناو بردووە، کە پایەدارمان کردبوون لە زەویدا، بەشێوەیەک ئێوەمان ئاوا پایەدار نەکردووە و بارانی زۆرمان بەردەوام بۆ دەباراندن، کە دەبووە هۆی پێگەیشـــتنی جۆرەهاڕووەک و بەروبووم، چەندەها جۆگەوڕووباریشـــمان لەناو کێڵگەو باخ و شـــارەکانیاندا بۆڕەخساندبوون خوڕەمی دەکرد، بەنێو درەخت و کۆشـــک و تەلاریاندا، بەڵام بەهۆی لادان و تاوان و گوناهیانەوە لەناومان بردن و نەوەی ترمان لە دوای ئەوان هێنایە کایەوە".

## ٦. خودا، فەرمانی بە فریشـتە و ئیبلیس(شـەیتان)کردووە، کەوا کڕنۆشی ڕێزگرتن بۆ مرۆڤبەرن:

خودای مـەزن، ڕێزێکی زۆری لـە مرۆڤ نـاوە، چونکە هـەندێ دەســـتکەوت و پلەو پایەی پێ بەخشـــیوە، بە هیچ بوونەوەرێکی دیکەی نەبەخشیوە، یەکێك لەو دەستکەوتانە، کە بە مرۆڤی بەخشیوە، فەرمانی بە

فریشـتە و ئیبلیس(شـەیتان)کردووە، کەوا کڕنوشـیڕێزلێنانی بۆ بەرن، بە جۆرێك، پێشـترنەلە ئاسـمان، نە لە زەوی، ئەم ڕێزە لە هیچ بوونەوەرێکی دیکە نەنراوە.

بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە،لەخوارەوە، بەڵگەکان دەخەینە ڕوو:

■ لە سـورەتی(الإسـراء)دا،خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ ﴾.

واتە:"وە باسی ئەو کاتە بکە، کە ئێمە بە فریشتەکانمان وت:کڕنۆش بەرن بۆ ئادەم، ئەوانیشـیەکسـەر هەموویانکڕنۆشـیان برد، جگە لە ئیبلیس(شـەیتان) نەبێت، وتی: ئایا من کڕنۆش بەرم بۆ کەسێك،کە لە قوڕ دروستتکردووە"؟

■ لە سـورەتی(الأعراف)دا دەفەرموێ:﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿١١﴾ ﴾.

واتە:"سوێند بێت، بێگومان ئێوەمان بەدیهێنا، پاشان شکڵ و شێوەی ئێوەمان کێشـا، پاشـان بە فریشـتەکانمان وت:کڕنۆش بەرن بۆ ئادەم، هەموویان یەکسـەر کڕنۆشـیان برد، جگە لە ئیبلیس(شـەیتان) نەبێت،کە لە کڕنۆشبەران نەبوو".

■ له سورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ:﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾

واتە:"بێنەوە بیر، کاتێک بە فریشتەکانمان وت:کڕنۆش بۆ ئادەم بەرن، جاهەمووانکڕنۆشـــیان برد، شـــەیتان نەبێت، کە گوێی نەدایەو خۆی بەگەورە زانی وەلە بێباوەڕان بوو".

■ لە سـورەتی(ص)دا، دەفەرموێ:﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى خَـٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَـٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾.

واتە:"کێشـەی فریشـتەکان کاتێك بوو، کە پەروەردگارت پێی وتن: من دەمەوێت بەشەرێک، لە قوڕ دروست بکەم!

جا کاتێك دروستمکرد و لەو گیان و ڕۆحەی کە من خاوەنی ئەوم، فووم پێداکردو گیان و ژیانم پێبەخشی، ئێوەی فریشتەشهەمووتان،بەفەرمانی من،کڕنۆشی ڕێزو تەقدیربۆ بەرن.

هەموو فریشـــتەکان فەرمانیخودایان بەجێهێنا و کڕنۆشـــیان برد،جگە لە ئیبلیس نەبێت، کە لەو کاتەدا، لەناو فریشـــتەکاندا بوو، فووی کردە خۆی و خۆی بەگەورە زانی و خۆی خستە ڕیزی کافرانەوە".

▪ له سووره‌تی (الکهف)دا، ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ﴾

واته: "بیریان بێنه‌وه، کاتێك به فریشته‌کانمان وت: کڕنۆش به‌رن بۆ ئاده‌م، ئه‌وانیش هه‌مووان، کڕنۆشیان برد، جگه له ئیبلیس نه‌بێت، که له پێڕی په‌رییه‌کان بوو، بۆیه له فه‌رمانی په‌روه‌ردگاری ده‌رچوو، ده‌ی ئێوه‌ی ئاده‌میزاده‌کان: ئایا شه‌یتان و زوڕییه‌ته‌که‌ی ده‌که‌ن به دۆست و پشتیوانی خۆتان له جیاتی من؟ له کاتێکدا که ئه‌وان دوژمنی ئێوه‌ن! ئای چ گۆڕینه‌وه‌یه‌کی خراپه بۆ سته‌مکاران"!

## ٧. خودا، به‌هه‌شتی کردووه به شوێنی نیشته‌جێبوونی مرۆڤ:

پله‌یه‌کی دیکه، له‌و پله‌یانه‌ی که‌خودای مه‌زن به مرۆڤی به‌خشیوه، بریتییه له نیشته‌جێکردنی مرۆڤ له ناو مێرگه ڕازاوه‌کانی به‌هه‌شتدا، بۆ ئه‌وه‌ی تیایدا ئۆقره بگرێ و بحه‌سێته‌وه‌و تا ئه‌به‌د، به خێرو خۆشیی له ناو به‌هه‌شتدا ڕابوێرێت.

هه‌ر بۆیه‌ش ئه‌گه‌ر(ئاده‌م و حه‌وا)، به گوێی شه‌یتانیان نه‌کردبایه و بێ فه‌رمانیخودایان نه‌کردبایه، مرۆڤ هه‌ر له به‌هه‌شتدا ده‌مایه‌وه و نه‌ده‌هاته سه‌ر ئه‌م زه‌وییه پڕ کێشه‌و قه‌یرانه و تووشی ئه‌م هه‌موو نه‌هامه‌تی و کاره‌سات و مه‌رگه‌ساته نه‌ده‌بوو!

خوای گەورە بەم شێوەیە باس لە نیشتەجێکردنی مرۆڤ دەکات لە ناو بەهەشتدا:

- لە سورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَـٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ ﴾

واتە:"وە وتمان: ئەی ئادەم خۆت و ژنەکەت نیشتەجێ بن لەم بەهەشتەدا، وە لە هەمووخواردەمەنییەکی بخۆن بەتێر و تەسەلی لە هەر شوێنێک کە حەز دەکەن، بەڵام نزیکی ئەم درەختە مەکەون، تا لە ستەمکاران نەژمێردرێن، تا نەبنە ستەمکار، ئینجا شەیتان هەڵی خەڵەتاندن لە بەهەشتدا، وەلەو خۆشگوزەرانییەی کە تێیدابوون، دەری پەڕاندن، وە بە ئادەم وحەواو شەیتانمان وت: بچنەخوارەوەبۆ سەر زەوی، هەندێکتان دوژمن دەبن لەگەڵ هەندێکتاندا، وە بۆتان هەیە جێگیربوون لەسەر زەویو بەهرەمەندیو ئارەزووی دنیا تاماوەیەک".

- لە سورەتی(طه)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَـٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَـٰنُ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ

ٱلْجَنَّةِ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ ﴾

واته:"ئینجا وتمان ئەی ئادەم، بەڕاستیی ئەم ئیبلیسەدوژمنی تۆو هاوسەرەکەتە، کەواتە ئاگادار بن، لە بەهەشت دەرتان نەکات، چونکە دووچاری ناخۆشی و زەحمەت دەبیت، بێگومان تۆ لەو بەهەشتەدا برسیت نابێ و ڕووت و قوت نابی، وە بێگومان لەودا تینووت نابێ و هەتاو(خۆر)، لێت نادات، ئازارت پێ ناگەیەنێت، ئینجا شەیتان نیازی خراپی خستە دڵییەوەو، وتی: ئەی ئادەم، ئایا نیشانت بدەم درەختی نەمری! هەر کەس لێی بخوات، هەرگیز نامرێ و موڵك و دەسەڵاتی هەرگیز دوایی نەیەت! ئینجا هەردووکیان لەو بەروبوومیدرەختەیانخواردو، بەو هۆیەوە،جل و بەرگیان داماڵدراو، عەیب و عەورەتیاندەرکەوت، وە دەستیانکرد بە داپۆشینی لەشیان، بە گەڵایدرەختەکانی بەهەشت، وە ئادەم سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کرد، ئیتر لەڕێگایڕاست لایدا، پاشان پەروەردگاری، هەڵیبژاردبۆ پێغەمبەرایەتی و تەوبەی لێ قبووڵ کردو ڕێنموونی کرد،خودا فەرمووی هەردووکتان لە بەهەشت بڕۆنەخوارەوە،نەوەکانتان بەیەکەوە دەبنە دوژمنییەکتری، جا ئەگەر لەلایەن منەوەبە پێغەمبەراندا، پەیامتان بۆ هات، ئەوسا ئەوەی شوێنیهیدایەتی من بکەوێ، ئەولە دنیادا گومڕا نابێ و لە ڕۆژی دواییشداتووشی ناخۆشی و سەختی نابێ".

■ له سورەتی (الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِىَ لَهُمَا مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ ۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾ ﴾.

واتە:"تۆش ئەی ئادەم، خۆت و هاوسەرەکەت لەبەهەشتدا نیشتەجێ بن، جا لە هەر کوێ ئارەزووتان لێبوو، خواردەمەنی و میوەیە بخۆن، بەڵام نزیکی ئەم درەختە مەکەون، درەختێکی تایبەتی بەرداربوو،خودای گەورە،بۆ تاقیکردنەوەیان، بڕیاریدا کە هەر نزیکی نەکەون، چ جای لە بەروبوومی بخۆن،چونکە ئەو کاتە دەچنە ڕیزی ستەمکارانەوە.

شەیتان ئەو سنوورەی بۆ ئادەم و حەوا بە دەرفەت زانی و ئینجا کەوتە فرێدانی وەسوەسەو خەتەرە و خەیاڵ بۆ ناو دڵ و دەروونیان، تا ئەو عەیب و عارەیان دەربخات، کە شاراوەبوو لێیان، دوایی خۆی ئاشکراکرد و پێی وتن: پەروەردگارتان ئەم درەختەی لێ قەدەغە نەکردوون، تەنها لەبەر ئەوەیە نەوەکو ببنە فریشتە،یاخود بۆ ئەوەیە، نەوەکو لە نەمران بن!

ئەوسا شەیتان زانی دەترسن و دوودڵن، سوێندی بۆخواردن، کەبەڕاستیی منبۆ ئێوە لە ئامۆژگارانو دڵسۆزانم!

ئیتر شـــەیتان بەفێڵ و پیلان، فریودان، بەرەولای درەختەکەی بردن، جاکاتێک تامی بەروبوومی درەختەکەیان چەشـــت، هەرچی عەیب و عاریان هەیە، کەوتە دەرەوە، ناچار بەپەلە دەســتیاندایە گەڵای درەختەکانی بەهەشـــت، عەیب و عاری خۆیانی پێ دادەپۆشــی و پەروەردگاریان بانگی کردن و فەرمووی:"ئایا من ئەو دارەم لێ قەدەغەنەکردن و پێم نەوتن، کە بەڕاستیی شـەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە"؟!

## ٨. خودا،هەرچی لە ئاسمان و زەویدا هەیە، بۆ مرۆڤی ڕام(ژێرەبار)کردووە:

پلەیەکی دیکە، کەخودای میهرەبان بە مرۆڤی بەخشـیوە، بریتییە لە ڕام(ژێرەبار)کردنی هەر چی لە ئاسـمان و زەویدا هەیە بۆ مرۆڤ، تاکو لەوپەڕی خۆشـی و بەختەوەری و سـەربەرزی و پێشـکەوتن و سـەرکەوتندا بژیت و هەموو ئەو کاڵاو کەلوپەل و بوونەوەرە بۆ بەختەوەری خۆی بخاتە کار و لێی بەهرەمەند و سوودمەند بێت.

خوای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا، لە چەندین شـوێن، ئاماژە بەم ڕاستییە دەکات، لەوانە:

- لە سـورەتی(الجاثية)دا، دەفەرموێ:﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعًا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ١٣ ﴾

واتە:"وە ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بۆ ئێوەی ژێرەبار کردووە، هەمووی لەلایەنخوداوەیە، بێگومان لەو شتانەدا چەند بەڵگە هەیە، بۆ کەسانێ بیربکەنەوە".

• لە سورەتی (لقمان)دا، دەفەرموێ:﴿ أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ ﴾

واتە:"ئایا سەرنجتان نەداوە، کە بەڕاستیی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە،خودا هەر هەموویبۆ خزمەتی ئێوەی دروستکردووە و ملکەچی کردووە، هەروەها بەفراوانی نازو نیعمەتی ئاشکراو پەنهانی بەسەردا ڕژاندون، لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێک لە خەڵکی موجادەلە و گفتوگۆی نابەجێ دەربارەیخودا وبەرنامەکەی دەکەن، بێ هیچ بەڵگەیەکی زانستی و ڕێنموویەکی پێغەمبەران و کتێبێکیڕوونکەرەوەیخودایی".

• لە سورەتی(النحل)دا، دەفەرموێ:﴿ وَالْأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾ وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ الْأَنفُسِ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ وَعَلَى اللَّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ وَمِنْهَا جَائِرٌ وَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩﴾ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ

مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴿١٠﴾
يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ
ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١١﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ
ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿١٢﴾ وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ
ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَا
وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ بِكُمۡ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَأَلۡقَىٰ
فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ وَأَنۡهَٰرٗا وَسُبُلٗا لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٥﴾
وَعَلَٰمَٰتٖۚ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

واته:"ماڵاتیشـــی دروســـتکردووه بۆ خزمەتی ئێوە، لە خوری و موو و پێســـتیان، جۆرەها پۆشـــاك و ڕایەخ دروســـت دەکەن، کە گەرمیتان پێ دەبەخشێتلە سەرماو سۆڵەدا، هەروەها جۆرەها سوودی تری لێ وەردەگرن لە شیرو گۆشتەکەشی دەخۆن..."

کـاتێك مـاڵاتـەکـان دەهێنـنـەوە لـە ئێوارانـدا، بـە تێری و شـــیرەوە،لـە بەرەبەیانەکانیشـــدا، کە لە ماڵ دەریان دەکەن، دیمەنێکی جوانتان بۆ دەنوێنن، دەروونی ئیماندار دەخرۆشێنن، بەجیاوازی شێوازو قەبارەو دەنگ و ڕەنگ و یاری و گەمەیان.

هەندێك لەو ماڵاتانە بارو کەلوپەلی سەنگینتان هەڵدەگرن بۆ وڵات و شوێنێك، کە ئێوە دوای زەحمەت و ماندووبوونێکی زۆر نەبێت پێی نەدەگەیشتن، بەڕاستیی پەروەردگارتان زاتێکی زۆر بە سۆزو میهرەبانە بۆ نەوەکانی ئادەم.

هەروەها چەندەها جۆری ئەسپ و ماین و هێسترو گوێدرێژی بۆ بەدیهێناون، تا بۆ سواری و گواستنەوە بەکاریبهێنن، سەرەڕای دیمەنی قەشەنگیان، بەتایبەت ئەسپ و ماین، کە لە سەردەمی زانستی و تەکنەلۆژیادا هەر بەکاردێنو شتی تریش دروست دەکات، کە ئێستا ئێوە نایزانن، ئەم ئاماژە قورئانییە، هەموو هۆیەکانی گواستنەوەی ئاسمانی و دەریایی و زەمینی دەگرێتەوە، کە ئادەمیزاد پەی پێ بردووەو پەی پێ دەبات، چونکە ئادەمیزاد خۆی و زانیاری و زانستەکەی و کەرەستە خاوەکان، هەر هەمووی بەخششیخودای بەدیهێنەری تواناو زانایە.

ڕوونکردنەوەمیرێبازیڕاست و بەرنامەی دروست لەسەرخودایە، دەبێت وریا بن، هەندێکرێبازی لارو چەوت و ناڕێکیش هەیە، خۆ ئەگەر بیویستایە هیدایەتی هەر هەمووتانی دەدا بەگشتی، سەرپشکی نە دەکردن، بەڵامرێزی لێناون.

پەروەردگار، ئەو زاتەیە کە لە ئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنێت، کە لێی دەخۆنەوە، هەروەها تێکەڵ بە جۆرەها شەربەت و شلەمەنیش دەیخۆنەوە و دەبێتە هۆیڕوان و گەشەکردنی درەخت و گژوگیاو ماڵاتی تیادا دەلەوەڕێنن.

هەر بەو بارانە، خودای گەورە جۆرەها کشـتوکاڵبۆتان دەهێنێتە بەرهەم، هـاورێ لـەگـەڵ زەیتون و خورمـاو جۆرەهـا ترێ، لـە هـەموو جۆرە بەروبوومێکیش، بەڕاسـتیی ئا لەوەدا بەڵگەو نیشـانەی تەواو هەیە، بۆ کەسانێك کە بیربکەنەوە.

هەروەها شەوو ڕۆژو خۆرو مانگی بۆ ئێوەڕام هێناوە، ئەستێرەکانیش بە فەرمانی ئەو زاتە ڕامهێنراون، بە ڕاستیی ئا لەو دیاردەو دروستکراوانەدا، بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك کە عەقڵ و ژیرییان بخەنەکار.

هەروەها شتی زۆرو جۆراو جۆرو هەمەڕەنگی لە زەویدا بۆ بەدیهێناون، کە بەڕاستیی ئا لەوەشدا بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك کە یاداوەری وەردەگرن.

هەر ئەو زاتەیە کە دەریای بۆ بارهێناون، تا گۆشتی تەڕو تازەی لێ بخۆن، تا لە ئاویدا جۆرەها گەوهەرو مرواری دەربهێنن و لە دەست و ملی بکەن، هەروەها کەشتییەکان دەبینیت، دەریا لەت دەکەن، تا فەزڵ و بەخششی تری پەروەردگار بەدەستبهێنن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریش بکەن.

هەرخودا لەسەر ڕووکاری زەوی، چیاکانی چەسپاندووە، تا لەنگەری بگرێت و ئێوە نەلەرزێنێت و لارتان نەکاتەوەو ژێرەو ژوور نەبن، هەروەها چەم و ڕووباروڕێگەوبانی تیادا بەدیهێناوە، بۆ ئەوەی ڕێ دەرکەن و بە مەرامی خۆتان بگەن.

هەروەها نیشانەی زۆرو زەبەندی لە زەویدا داپینکردووە، وەکو کەژو کێوەکان و، چەم و ڕووبارەکان و بەرزی و نشێوەکان، تا ون نەبن، لە شەوگاریشداو بەهۆی ئەستێرەکانەوە، خەڵکیرێی خۆیانبزانن".

■ لە سورەتی (الحج)دا، دەفەرموێ:﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٥﴾ ﴾

واتە:"ئایا نابینی (نازانی)؟ بەڕاستییخودا هەموو ئەو شتانەی لە زەویدا هەیە،ڕامی هێناوە بۆتان، وە کەشتیشیڕامهێناوە،بە فەرمانی خودا، دەڕوات بەناو دەریادا، وە ئاسمانیڕاگیرکردووە، تاکو نەکەوێ بەسەر زەویدا، مەگەر بەفەرمانی ئەو، بەڕاستییخودا دڵسۆزو میهرەبانە بەرانبەر بە خەڵکی".

■ لە سورەتی (إبراهیم)دا، دەفەرموێ:﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾ ﴾

واتە:"خودا، ئەو زاتەیە، کە ئاسمانەکان و زەویی دروستکردووە و، لە ئاسمانەوە بارانی باراندووەو، هەموو بەروبووم و دانەوێڵەیەکی پێڕواندووە،

که ڕزق و ڕۆزییە بۆ ئێوە، هەروەها کەشـتیی بۆڕام هێناون، بۆ ئەوەیبە فەرمانیخودا،بڕوات بەناو دەریادا و ڕووبارەکانی بۆڕامهێناون، هەروەها ڕامی هێناوە بۆتانڕۆژ و مانگ بە هەمیشـەیی، وە شـەو و ڕۆژیشـی بۆڕام هێناون، وە لە هەموو ئەو شـتانە کە داواتان کردووە، پێی بەخشیوون، خۆ ئەگەر بەهەرەو نیعمەتەکانیخودا بژمێرن، بۆتان ناژمێردرێن! بەڕاستیی ئادەمیبێباوەڕ وزۆر ستەمکار و سپڵەیە".

●لە سورەتی(مریم)دا، دەفەرموێ:﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾

واتە:"ئەوخودایەی کە زەویی بۆڕاخستوون، وە ئاسمانی بۆ کردوون بەکۆشک، ئاسمانی بۆ گێڕاون بەگومەزی، وە ئاوی بارانی لە ئاسمانەوە هێناوەتەخوارەوە، ئینجا بەو ئاوە، هەموو جۆرە میوەو بەرێک بۆڕۆزیی ئێوە بەرهەمهێناوە. کەواتە هاوتا بۆخودا پەیدا مەکەن، کە ئێوە خۆتان دەزانن بێ هاوتایە".

### ٩. خودا،عەقڵ و هزری بە مرۆڤ بەخشیوە:

گەورەترین نیعمەت، کەخودای مەزن بە مرۆڤی بەخشـی بێت، بریتییە لە عەقڵ و هزر(بیرکردنەوە).

چونکە مرۆڤ بەهۆی عەقڵ و بیرکردنەوەوە دەتوانێڕەش لە سپیو، چاکە لە خراپەو، ڕاست لە ناڕاستو خێر لە شەڕ جیابکاتەوە.

بێگومان،خوای میهرەبان،عەقڵ و هزری کردووە بە پێوەر،بۆ جیاکردنەوەی مرۆڤێکی(تەکلیفلێکراو) لە مرۆڤێکی(تەکلیف لێنەکراو)، یان مرۆڤێکی(عاقڵ) لە مرۆڤێکی(شێت)!

وشەی عەقڵ و هزر، هەروەها ئەو وشانەی پەیوەندییان بەو دوو وشەوە هەیە، زۆر جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە،بۆ نموونە: چل و نۆ جار وشەی(العقل)، لە قورئاندا هاتووە.

بیست و چوار جار وشەی (تعقلون)، لە قورئاندا هاتووە.

بیست و دوو جار وشەی (یعقلون)،لە قورئاندا هاتووە.

وشەی (یعقِلُها)، یەك جار لە قورئاندا هاتووە.

وشەی (عقَلوه)، یەك جار لە قورئاندا هاتووە.

وشەی(نعقل)، یەك جار لە قورئاندا هاتووە.

شانزدە جاروشەی (الألباب)، لە قورئاندا هاتووە.

یەك جاروشەی (الحِجْر)،لە قورئاندا هاتووە.

یەك جار وشەی (فكَّر)، لە قورئاندا هاتووە.

یەك جار وشەی (تتفكَّروا)،لەقورئانداهاتووە.

یەك جار وشەی (تتفكَّرون)،لەقورئانداهاتووە.

یەك جار وشەی (یتفكَّروا)،لەقورئانداهاتووە.

یەك جار وشەی (تتفكَّرون)،لەقورئانداهاتووە.

یانزدە جاریش وشەی (یتفكَّرون)،لەقورئانداهاتووە.

هەڵبەت، خودای دلۆڤان، عەقڵ و هزرێکی مەزنی بە مرۆڤ بەخشیوە، تاکو کوێرانە لاسایی ئەم و ئەو و فلان و فیسار نەکاتەوە، بەڵکو کەسێکی

دووربین و وردبین و چاوکراوە و بیرتیژ و لێزان بێت و قوفلی نەزانین لە مێشـــکی نەدات و عەقڵ و هۆشـــی خۆی بخاتە کار و بە باشـــی بیر بکاتەوە. ئەم بەڵگانەیخودارەوەش مشتێکن لە خەروارێك:

●لە ســـورەتی (آل عمران)دا، دەفەرموێ: ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٧﴾

واتە:"جا ئەو کەســـانەی کە لە زانســـتدا ڕۆچوون دەڵێن: ئێمە باوەڕی دامـەزراومـان بـەهـەر هـەموو ئـەو ئـایـەتـانـە هـەیـە، کـە لـەلایـەن پەروەردگارمانەوەیە و فەرمایشی ئەوە، لە ڕاستیدا، جگە لە خاوەن بیر و ژیرەکان،یاداوەری وەرناگرن و بیرناکەنەوە لەم قورئانە".

● لە سورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩٧﴾

واتە:"وە توێشووی پارێزکاریی هەڵبگرن، کەباشترین توێشوو، لەخودا ترسانە، وەلەمن بترسن، ئەیهۆشمەندان".

●لـە ســـورەتی(آل عـمران)، دەفـەرموێ:﴿إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩٠﴾

واتە:"بەڕاستیی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویداو لە جیاوازی و گۆڕانی شەوو ڕۆژدا، چەندەها بەڵگە هەیە بۆ خاوەن ژیرییەکان".

●لە سورەتی(الزمر)دا، دەفەرموێ:﴿قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٩﴾

واتە: "بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن، بەڕاستیی تەنیا ژیرمەند و عاقڵمەندەکان ئامۆژگاریی وەردەگرن".

●لە سورەتی(الحجر)، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴿٥﴾ ﴾

واتە: "سوێند بە بەرەبەیان، وە بە دە شەوەییەکەمی مانگی قوربان، وە بەتاک و جووت، وە بەشەوگار، کاتێک کە تێدەپەڕێت، ئایا ئەمانەی کە سوێندیان پێ خورا، شایستەی سوێند پێخواردن نین لای تێگەیشتوو(عاقڵ)"؟!

●لە سورەتی(البقرة)دادەفەرموێ: ﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ ﴾

واتە: "ئایا هیچ کەسێك لە ئێوە حەز دەکات باخێکیهەبێت، لە دارخورماو چەندەها جۆرڕەزە ترێپێکهاتبێت و چەند جۆگەوڕووبارێک بەژێر درەختەکانیدا بڕوات و هەموو جۆرە بەروبوومێکی تێدابێت بۆ خاوەنەکەی و خۆی دووچاری پیری بووبێت و چەند نەوەو منداڵێکی لاوازی هەبێت، کەچی لەناکاو، گەردەلولێک گڕوگەرمییەکی بەهێزی تێدابێت و هەڵکاتەسەری و یەکسەربسووتێت؟! ئەمە زۆر جێی داخ و نیگەرانییە، چونکە نەخۆی لەبەر پیری، نەمنداڵەکانی، لەبەر بێ هێزی، ناتوانن

باخەکە ئاوەدان بکەنەوە، ئا بەو شێوەیە، خودا ئایەتو بەڵگەو نیشانەکانی دەخاتە بەرچاوتان، بۆ ئەوەی تێفکرن و بیربکەنەوە و خۆتان مایەپووچ و رەنج بەخەسار نەکەن".

- لە سورەتی(یونس)دا،دەفەرموێ:﴿إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾﴾

واتە:"بێگومان نموونەی ژیانی ئەم دنیایە، هەر لەو بارانە دەچێت، لە ئاسمانەوە دامانباراندووە، جا بەهۆیەوەهەرووەکی زەویی گەشەدەکات و بەیەکداچوونبەروبوومی خۆی پێشـــکەش دەکات لەوخۆراکانەی کەهەم خەڵکی و، هەم ئاژەڵیش لێی دەخۆن، هەتا کاتێک وای لێ دێت، زەویی بەجوانی نەخشـــونیگاری خۆی دەردەخات و خۆی دەرازێنێتەوە،خەڵکەکەی واگومان دەبەن، بەڕاســـتییەمیشـــە دەســـەڵاتداری تەواون بەســـەریدا، ئا لەوکاتەدا کەخەڵکی خراپ و غافڵن و دڵیان بەدنیا خۆشـــەو هەرچی تاوان وگوناهەدەیکەن، ئەوە فەرمانی ئێمەیان بۆ دەردەچێت لەشـــەودا،یان لەڕۆژدا، ئەوســـا وەک کشـــتوکاڵی دروێنەکراوی لێ دەکەین، هەروەکو دوێنێ نەبوویێت، ئابەو شـــێوەیە ئایەتەکانی خۆمانڕوون دەکەینەوە، بۆ کەســـانێک، کە بیر بکەنەوەو تێفکرن، وا دیارهەڕۆژێک دێت، پێشـــکەوتنی زانســـت

دەگاتە ئاستێکی زۆر باڵا، خەڵکی ئەو سەردەمە زۆر غەرِا دەبن، بەڵام لەپڕێکدا، خودا کۆتایی بەهەموو شتێک دەهێنێت".

• لە سورەتی(الرعد)دا، دەفەرموێ:﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ ﴾

واتە:"خودا، ئەو زاتەیە،کە زەوییڕاخستووە، بەپانی و درێژی و، چەندەها چیاو ڕووباری تێدا داناوە(دروستکردووە)، هەروەها لە هەموو جۆرە میوەیەك، جوتێ نێرو مێی تێدا دروستکردووە، شەو دەدات بەسەر ڕۆژدا، بەڕاستیی لەوانەدا بەڵگەو نیشانە هەیە، بۆ ئەو کەسانەی کە بیر دەکەنەوە".

## ١٠. خودا، هێزی ئاخاوتنی بە مرۆڤ بەخشیوە:

نیعمەتێکی دیکە، کەخودای مەزن بە مرۆڤی بەخشیوە و بە زۆرێك لە گیانەوەرانی دیکەی نەبەخشیوە، بریتییە لە ئاخاوتن(پەیڤین).

بەڕاستیی زمان، ئامرازێکی زۆر کاریگەرە لە ژیانی هەر مرۆڤێکدا،خودای مەزن بە مرۆڤەکانی بەخشیوە، تاکو لە یەکتری تێبگەن و لە یەکتری حاڵی بن و هەست بە دەرد و نەخۆشییەکانی یەکتری بکەن و زانیاریی لەگەڵ یەکتری ئاڵوگۆڕ بکەن.

بۆیە زمان بۆ مرۆڤەکان زۆر گرنگە، چونکە پردێکی پەیوەندی لە نێوانیاندا دروست دەکات و لە ڕێی زمانەوە دەتوانن گوزارشت لە هزر و بیر و ناخی خۆیان بکەن.

خوای گەورە لە چەندین شوێنی قورئاندا، باسی لە گرنگی زمان کردووە بۆ مرۆڤ، لەوانە:

- لە سورەتی(الرحمن)دا، دەفەرموێت: ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ﴿٤﴾ ﴾

واتە:"خودای بەخشندە، قورئانی فێریمحەمەد(ﷺ)کرد، ئادەمی دروستکرد، وە فێری گفتوگۆی کرد".

- لە سورەتی(الروم)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾

واتە:"وەلە نیشانەکانی دەسەڵاتیخودا،دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی زمانتان و ڕەنگەزتانە، بەڕاستیی لەوەدا، کە باسکرا، بەڵگەی زۆر هەیە بۆ زانایان".

- لە سورەتی(البلد)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلِسَانٗا وَشَفَتَيۡنِ ﴿٩﴾ ﴾

واتە:"وە زمانێک و دوو لێومان پێ نەداوە"؟

- لە سورەتی(إبراهیم)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٤﴾ ﴾

واتــە:"وە هیچ پێغەمبەرێکمانڕەوانە نەکردووە، بە زمانی گەلەکەی خۆی نەبێت، بۆ ئەوەی ئایینەکەیان بۆڕوون بکاتەوە، ئەوسا خودا، هەر کەسێکی ویستبێ، گومڕای کردووە، هەرکەسێکیشی ویستبێ،هیدایەتی داوە، هەر ئەویش زاڵی کاردروستە".

●لە سورەتی(مریم)دا، دەفەرموێت:﴿ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾ ﴾

واتە:"لە ڕەحمەتی خۆمان، ئەوانمان بەهرەمەندکرد، باسی چاکەی ئەوانمان خستە سەر زمانیئادەمیزادەکان".

● لە سورەتی (النساء)دا، دەفەرموێ:﴿ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ ﴾

واتە:"وەخودالەگەڵ مووسا قسەی کرد، بە قسەکردن".

## ١١. خودا، ئازادیی بە مرۆڤ بەخشیوە:

یەکێك لەو مافەگەورانەی کەخودای میهرەبان بە مرۆڤی بەخشیوەو بە زۆرێك لە بوونەوەرەکانی دیکەی نەبەخشیوە، بریتییە لە ئازادی بیر وباوەڕ،واتە، مرۆڤ بە ئازادیی لە دایك دەبێت و ئازادە لە هەڵبژاردنی ئەو ئایین و بەرنامەی کە خۆی دەیەوێت و ئەو ڕێبازەی کە خۆی هەڵیدەبژێریت و دەیگرێتەبەر، چونکە مرۆڤ خاوەن عەقڵ و ژیری و هزر و ویژدان و هەستە! دەتوانێ سپی لە ڕەش، چاکە لە خراپە، ڕاست لە چەوت و پاك لە پیس جیابکاتەوە.

هەڵبەت،خودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا باس لە ئازادیی مرۆڤ دەکات، بۆ نموونە:

■ لەبارەی ئازادیی بیروباوەڕەوە،خودای مەزن لە سورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ:﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَيِّ ﴿٢٥٦﴾ ﴾

واتە:"بەهیچ جۆرێک زۆرکردن نییە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا، نابێت بەزۆر دینداری بکرێت و دین بەزۆر نادرێت بەسەر کەسدا، چونکە بەڕاستیی ڕێبازی چاک و دروست؛ ڕوون و ئاشکرا بووە و جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی".

●هەروەها لە سورەتی(الإنسان)دا، دەفەرموێ:﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ ﴾

واتە:"بەڕاستیی ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزادا هات، کە شتێکی وانەبوو ناو ببرێت.بێگومان ئێمە ئینسانمان دروستکرد لە تێکەڵەیەک، لە سەرەمێکوتەیەکی بچووک و هێلکۆکەیەک، لە کاتێکدا دەمانەوێت تاقی بکەینەوە، هەر بۆیە دەزگای بیستن و بینینمان پێبەخشی، بەڕاستی ئێمەڕێنموویمان کرد بۆڕێگەیڕاست، بە ئازادیی دەتوانێت ببێتە کەسایەتییەکی ئیماندار و سوپاسگوزار، یان بێ باوەڕ وخودانەناس".

●له سورەتی (الكافرون)دا، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾.

واتە: "ئەی بێباوەڕینە، من ئەو بتانە ناپەرستم، کە ئێوە دەی پەرستن، وە ئێوەش ئەوخودایە ناپەرستن، کە من دەی پەرستم، وە من ئەوخوداپەرستییە ناکەم، کە ئێوە دەیکەن، وە ئێوەش ئەوخوداپەرستییە ناکەن، کە من دەیکەم، ئایینی خۆتان بۆ خۆتان، ئایینی خۆمیش بۆ خۆم".

●له سورەتی (الكهف)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾.

واتە: "پێیان بڵێ: هەق هەر ئەوەیە، کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتانرەوانەکراوە، جا ئەوەی دەیەوێت، با باوەڕ بهێنێت و، ئەوەی دەیەوێت، با کافرو بێباوەڕ بێت".

■ له سورەتی (المدثر)دا دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ ﴾

واتە: "هەموو کەسێك بارمتە(ڕەهین)ی کردەوەی خۆیەتی".

### ١٢. خودا، عیلم و زانستی بە مرۆڤ بەخشیوە:

هەموو مرۆڤێك، بە نەزانی و لاوازی و بێدەسـەڵاتی لە دایك دەبێت، بەڵامخودای گـەورە، بـە لوتف و کـەرەمی خۆی، ئـەو بـەهرەیـەی پێ بەخشیوە، کە لە ڕێگەی عەقڵ و هۆش و هزرو هەر پێنج هەستەکانییەوە، فێری زانست و زانیاری و ئاخاڤتن بێت و بە زمانی جیاجیا قسە بکات و گوزارشت لە هزرو بیرو ناخی خۆی بکات و لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بیروڕا ئالۆگۆڕ بکات .

هەر وەك لە چەند سـورەتێکی قورئانی پیرۆزدا، ئاماژە بەم هەقیقەتە دەکات، لەوانە:

■ لە سورەتی(العلق)دا، دەفەرموێ: ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ۝٣ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝٥ ﴾

واتە: "ئەی محەمەد(ﷺ)، بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە، کەهەموو شـتێکی دروسـتکردووە، مرۆڤی دروسـتکردووە لە خوێنێکی بەسـتوو، بخوێنە،پەروەردگاری تۆ، لە هەموو کەسبەخشـدەترە، ئەوەی کە مرۆڤی فێری نووسـینکردووە بەقەڵەم، مرۆڤی شـارەزا کردووە بەو شـتانەی کە نەی دەزانی".

●لە سورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ

﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ﴿٣٣﴾

واتە: "بیریان بێنەوە، کاتێک کە پەروەردگاری تۆ، بە فریشـــتەکانی وت: بەڕاستیی من جێنشینێک لەسەر زەویدروست دەکەم.

فریشـــتەکان وتیان: ئایا کەســێکی وای تیا دروســـت دەکەیت، کە خراپەو بەدیی تێدا بکـات، وە خوێنی تیـا بڕێژێـت؟ لـە کـاتێکدا، کـە ئێمەیادت دەکەین، بەستایشکردنت، وە بەپاک ڕاتدەگرین!

خودا فـەرمووی: بێگومـان ئەوەی من دەیزانم، ئێوە نایزانن،خودا ناوی هەموو شـــتێکی فێری ئادەم کرد، لە پاشـــان ئەو شـــتانەی نیشـــانی فریشتەکانیشی دا، وەخودا پێی فەرموون: ناوی ئەمانەم پێ بڵێن ئەگەر ڕاســـت دەکەن، کە ئێوە لە ئادەمی باشـــترن؟ هەموو وتیان:خودایە تۆ پـاکیت لـە هـەڵـە، ئێمـە هیچ نـازانین، مـەگـەر ئـەوەی کـە خۆت فێرت کردبین، بـەڕاســـتیی هەر تۆیت زاناو دانا. خودا فەرمووی:ئەی ئادەم نـاوی ئـەو شـــــتانەیانپێ بڵێ. جا کاتێک کە ناوەکانی پێ وتن،خودا فەرمووی: ئەی پێم نەوتن؟ بێگومانمن ئاگادارم بە نهێنیی ئاسـمانەکان و زەوی، وە ئـاگادارم بەوەی کە بە ئاشـــکرا دەیکەن، وە بە ئەوەی کە دەیشارنەوە"؟

•له ســورەتی(المجادلة)دا، دەفەرموێ:﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾

واتە:"خوای گەورە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوە و ئەوانەشــتان زانســت و زانیارییان پێدراوە، چەندەها پلەو پایە بەرزیان دەکاتەوە،خودایش ئاگایە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن".

•له سورەتی(القلم)دا، دەفەرموێ:﴿ نٓۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ ﴾

واتە:"بە(نوون) دەخوێنرێتەوە، ســوێند بە پێنووس و بەو دێڕانەی دەینووسن".

▪ له سورەتی(الزمر)دا، دەفەرموێ:﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ ﴾

واتە:"بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن،یەکســانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن؟ بەڕاستیی تەنیا خاوەنانی ژیریی ئامۆژگاریی وەردەگرن".

▪ له سورەتی(فاطر)دا، دەفەرموێ:﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ ﴾

واتە:"بەڕاســتیی هەر زاناکان پەی بەو نهێنییانە دەبەن و لەناو بەندەکانیخودادا هەر ئەوان لەخودا دەترسن، لەسەردەمی علم و زانستدا، ئەم ڕاســتییەڕوونە، چونکە کاتێك زانا و پســپۆران،پەی بە وردەکاریی بەدیهێنراوان دەبەن، زۆر هەســت بە گەورەیی و دەســەڵاتیخودا دەکەن،

بەڕاستیی ئەوخودایە زۆر باڵادەستە و،زۆریشلێوردە،کاتێکڕووی تێدەکەن و باوەڕی پێدەهێنن".

## ۱۳. خودا،ژیانی بە مرۆڤ بەخشیوە:

ژیان و بوونی مرۆڤ بە دەستخودایە و،جگە لەخودا، لە دەسەڵاتی هیچ کەسێکدا نییە ژیان بە مرۆڤ ببەخشێت و گیان بکات بە بەریدا، بۆیە مەزنترین نیعمەت، کەخودا بە مرۆڤی بەخشی بێت، بریتییە لە نیعمەتی ژیان، واتە،خودای دڵۆڤان، مرۆڤی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوونەوەو مافی ژیانی پێ بەخشیوە، هەر وەك لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا ئەم ڕاستییە دەخاتە ڕوو، لەوانە:

- لە سورەتی(النساء)دا، دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ﴿١﴾ ﴾

واتە:"ئەی خەڵکینە، لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن، کە ئێوەی لە تاکە نەفسێک دروستکردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدیهێناو، لەو دووانە، پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بڵاوکردەوە".

- لە سورەتی(الانعام)دا دەفەرموێ:﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾ ﴾

واتە:"خودا ئەو زاتەیە، کە ئێوەی لە قوڕێک دروستکردووە، لەوەودوا کاتێکی بڕیاریدا، کە خەوتنە، وەک نیوە مەرگێک،بۆ ماوەیەکبەشێک

لەئەندامە هەستیارەکان لەکار دەکەون، وە کاتێکی دیاریکراوی تریشی لای خۆی بڕیارداوە، بۆ هەموو کەسێک، کە کاتی تەواوبوونی تەمەنیەتی، پاش ئەو هەموو بەڵگانە بۆ دەسەڵاتی بێ سنووریخودا، کەچینێوە ئینکاری زیندووبوونەوە دەکەن و هەر لە گوماندان"!

■ لە سورەتی(الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ ﴿١١﴾ ﴾

واتە:"سوێند بێت بێگومان ئێوەمان بەدیهێنا، پاشان شکڵ و شێوەمان کێشان، پاشان وتمان بە فریشتەکان:کڕنۆش بەرن بۆ ئادەم، هەموویانیە کسەرکڕنۆشیان برد، جگە لە شەیتان نەبێت، کە لە کڕنۆشبەران نەبوو".

■ دیسان لە سورەتی(الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ﴿١٨٩﴾ ﴾

واتە:"خوا ئەو زاتەیە، کە ئێوەی دروستکردووە لە یەك کەس، کە (ئادەم)ە، هەر لەخۆیشی هاوسەری بەدیهێناوە، تا لەلای بحەسێتەوە(ئارام بگرێت)".

●لە سورەتی(الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ ﴾

واتە:"سوێندبێ، بێگومان ئێمە ئادەمیمان دروستکرد لە قوڕێکیڕەشی ترشاویڕەق".

■ لە سورەتی (النحل)، دەفەرموێ:﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ ﴾

واتە:"ئادەمی دروستکرد لە دڵۆپە ئاوێك، کەچی بۆتە دوژمنێکی ئاشکرا".

● لە سورەتی(مریم)دا، دەفەرموێ:﴿ أَوَلَا يَذْكُرُ ٱلْإِنسَـٰنُ أَنَّا خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا ﴿٦٧﴾ ﴾

واتە:"ئەوە ئادەمیزاد بۆ بیرناکاتەوە؟ کە بێگومان ئێمە لە سەرەتاوە ئەومان دروستکردووە، کە ئەو هیچ نەبوو"!

● لە سورەتی(الأنعام)دا، دەفەرموێ:﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾

واتە:"وە ئەوخودایە زاتێکە، کە ئێوەی دروستکردووە لە یەك کەس(ئادەم)، ئینجالە پشتی باوکتانا نیشتەجێکران، دواتریشبە شێوەیەکی کاتیی، لە منداڵدانی دایکتاندا دانران، بەڕاستیی ئایەتەکانمانڕوونکردۆتەوە بۆ کەسانێ، بهوردی بیربکەنەوە".

●لە سورەتی(الأعراف)دا، دەفەرموێ:﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ۖ ﴿١٨٩﴾ ﴾

واته:"خودا ئەو زاتەیە، کە ئێوەی دروستکردووە لەیەك کەس، کە (ئادەم)ە، هەر لەخۆیشی هاوسەریی بەدیهێناوە، تا لەلای بحەسێتەوە(ئارام بگرێ)".

●لە سورەتی(المؤمنون)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

واته:"سوێند بەخودا، بەڕاستیی مرۆڤمان دروستکرد لە خولاسە و پاڵفتەیە لە قوڕ،لە پاشان ئەومانکرد بە نوتفەیەك، لە ئارامگایەکی قایملە ناو (منداڵدانی دایك)دا،دواتر نوتفەکەمانکرد بە خوێنی مەیبو، ئینجا خوێنە مەییوەکەشمان کرد بە پارچە گۆشتێکی جوواو، ئینجا ئەویشمان کرد بە ئێسقان، ئینجا پەیکەرەئێسکەکەمانبە گۆشت داپۆشی، پاشان ئەومانکرد بە دروستکراوێکی تر. جا گەورە و پیرۆزە ئەوخودایەی، کە چاکترینی بەدیهێنەرانە،پاشان بەڕاستیی ئێوە لەدوای ئەوە، هەمووتان دەمرن،لەپاشان، بێگومان ئێوە لە ڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێنەوە".

■ لە سورەتی(الإنسان)دا، دەفەرموێ: ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَـٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ ﴾.

واتە:"بێگومان ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگاربەســـــەر ئادەمیدا تێپەڕی، کە شتێکی وانەبوو ناوببرێ،بەڕاستیی ئێمە ئادەمیزادمان دروستکرد لە دڵۆپێك ئاوی تێکەڵ لە گەلێ توخم، تا تاقی بکەینەوە، ئینجا گێڕامان بە بیسەری بینەر".

## له كوێ هاتیت؟

هەر لەگەڵ پەیدابوونی ژیان لەسەر هەسارەی زەوی، ئەم پرسیارە لە ناو مێشکی مرۆڤەکاندا پەیدا بووە، ئاخۆ مرۆڤ لە کوێ هاتووە، بە واتایەکی دیکە: کێ مرۆڤی هێناوەتە بوون(وجود)ەوە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، مرۆڤەکان بەسەر دوو بەرەدا دابەشبوون، بەرەی بێباوەڕان و بەرەی باوەڕداران.

هەڵبەت، بێباوەڕانیش دەکرێن بە دوو لقەوە:

لقی یەکەم: پێیان وایە مرۆڤ بەرهەمی سروشتە، وایە، سەرەتا وەك گیا شین دەبێ و پەیتا پەیتاگەورە دەبێ، ئینجا کە پیر بوو، سیسهەڵدەگەڕێ وکۆتایی پێ دێ و ئەم سناریۆیە، واتە لە دایك بوون، ئینجا مردن، تا ئەبەد لەسەر ئەم هەسارەیە بەردەوام دەبێ و ئەم دنیایە، دنیایەکی جاویدانییە و هیچ خاوەنێکی نییە و هەتا هەتایە دەمێنێتەوە و لەناو ناچێت!

لایەنگرانی ئەم بیرۆکەیە بە سروشتگەرا ناسراون،چونکە بوونی مرۆڤ دەدەنە پاڵ سروشت و،باوەڕیان بە زیدووبوونەوەو هەق و حیساب و بەهەشت و دۆزەخ نییە.

کەچی لقی دووەم: لە بێباوەڕان، کە بە(داروین و لایەنگرانی بیردۆزی داروینیزم) ناسراون،پێیان وایە، ئەسڵی مرۆڤ لە مەیموونەوەسەرچاوەی گرتووە، واتە: مرۆڤ سەرەتا مەیموونبووە! ئینجا پەیتا پەیتا پەرەی

سەندووە و گەشەی کردووە، تا بووە بە مرۆڤ! ئەم بیردۆزە، بە بیردۆزی پەرەسەندن باوە.[11]

بەڵام زانایان ئەو بیردۆزەیان ڕەتکردۆتەوە،کۆمەڵێک زانای ئەمریکی، توێژینەوەیەکیان لەسەر ئەو بۆهێڵە کردووە کە بەرپرسە لە زمان و قسەکردنی مرۆڤ و ئەنجامی توێژینەوەکەشیان بیردۆزی پەرەسەندنی داروینڕەتدەکاتەوە.

بە گوێرەی سایتی تورك لایف، گۆڤاری"سێڵ"، توێژینەوەیەکی کۆمەڵێك زانای ئەمریکی بڵاوکردەوە لەبارەی ئەو بۆهێڵەی کە بە"فۆکس پی دوو"، ناسراوە و بەرپرسە لە پەرەسەندنی زمانی قسەکردن و فێربوون لەلای مرۆڤ.

پێشتر وا باوەڕدەکرا کە ئەو بۆهێڵە جیاکەرەوەیەکی بە دانیشتوانی ئێستای جیهان داوە و دانیشتوانی سەرەتا نیشتەجێبووی سەر زەوی، ئەو جیاکەرەوەیان لە زمان و قسەکردن نەبووە.

کەچی لە توێژینەوەی ئەو کۆمەڵە زانایەی ئەمریکا ئەوە دەرکەوتووە کە یەك کۆپی لەو بۆهێڵە لەوانی دیکە باوترە، بەڵام کاتێك هەریەکە و بە تەنیا سەیری جیاوازییەکان لە مرۆڤایەتی بکرێت، ئەوە جیاوازییەکیڕوون دەبیندرێت.

---

١)داروین، زانایەکی زیندەوەرزانی بەریتانی بوو، لە نێوان ساڵانی(١٨٠٩- ١٨٨٢) لە بەریتانیا ژیابوو، خاوەنی بیردۆزی پەرەسەندن بوو، ئەو پێی وابوو مرۆڤ لە ئەسڵدا مەیموونە.

لەبەر ئەوە ئێستا پاڵنەرێك لای زانایان هەیە كە لە پرۆسەی پەرەسەندنی مرۆڤەوە دووبارە چاو بە ڕۆڵی ئەو بۆهێڵەدا بخشێننەوە. ئەنجامی ئەو توێژینەوەیە، پێچەوانەی بیردۆزی داروینە، كە لەبارەی پەرەسەندنەوە دایناوە و ئەسڵی مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ سەر مەیموون!

بەڵام بەرەی باوەڕداران وخوداناسان، بە پێچەوانەی ئەوانی دیكە، بوونی مرۆڤ دەدەنە پاڵخودا، واتە باوەڕیان بە(الله)هەیە،كە خالق و بەدیهێنەری مرۆڤە. هەروەها باوەڕیان بەوە هەیە كە مرۆڤ بوونەوەرێكی سەربەخۆیە، نەك لە(مەیموون)ەوە سەرچاوەی گرتبێت.

بۆیە باوەڕیان بەو پەیامە هەیە، كەخودای مەزن لە ئادەمەوە تا خاتەم، لە ئاسمانەوە بۆ سەر مرۆڤی دابەزاندووە و تێیدا هەقیقەتی دروستبوون و هاتنی مرۆڤ بۆ سەر ئەم هەسارەیە دەخاتە ڕوو و پێمان دەڵێت: مرۆڤ سەرەتا لە خۆڵ دروستكراوە، ئینجاخوداگیانی كردووە بە بەریدا.

هەروەك لە قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا، ئاماژە بەم هەقیقەتە دەكات، لەوانە:

■ لە سورەتی(الإنفطار)دا،دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ ﴾.

واتە:"ئەی ئینسان، چی تۆی خەڵەتاندووە بە پەروەردگاری گەورەو بەخشندەت، ئەوپەروەردگارەی كە دروستی كردوویت و ڕێكی خستویت و جیای كردویتەوە لە گیانلەبەرانی تر،لە هەر وێنەیەكدا كە خۆی ویستبێتییەكی خستوویت".

• له سورەتی (الحج)دا، دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ۝٥ ﴾

واتە: "ئەی خەڵکینە، ئەگەر ئێوە گومانتان لە زیندووبوونەوە هەیە، ئەوە چاك بزانن کە ئێمە سەرەتا ئێوەمان لە خاك و خۆڵ دروستکردووە، لەوەودوا، نەوەکان لە نوتفەیەك پەیدا بوون، پاشان نوتفەش دەبێتە خۆ هەڵواسەرێك لەناو منداڵداندا، لەوەودوا دەبێتە گۆشتپارەیەکی تەواوو سەرو سیمادار،یان ناتەواو، هەموو ئەم شتانە دەهێنینەوەهیادتان، تا بۆتانڕوون بکەینەوە، کە ئێمە ئاوا ئێوەمان دروستکردووە و دووبارە دروستکردنەوەشتان لامان ئاسانە، ئەوەش بمانەوێت لە منداڵدانەکاندا جێگیری دەکەین، تا کاتێکی دیاریکراو، لەوەودوا بەساوایی و بەبچووکی دەرتاندەهێنین لە سکی دایکتان، دوایی بۆ ئەوەی گەورە ببن و بگەنە ئەوپەڕی هێزو تواناتان، هەتانەبەگەنجیدەمرێنرێت ، هەشتانە دەگەڕێنرێتەوە بۆ پەڕپووتترینی تەمەنەکان، بۆ ئەوەی هیچ شتێك نەزانێت، دوای ئەوەی جاران دەیزانی، بەڵگەیەکی تریش لەسەر

زیندووبوونەوە ئەوەیە، کە ئەی ئینسـان: تۆ زەویش دەبینیت وشـك و برنگە، جا کاتێك ئاوی بارانمان بەسەردا باراند، دادەچڵەکێت و دەلەرزێت و تۆوەکان چەکەرە دەکەن و ڕەگ و چڵ دەردەکەن و دەڕوێن، ئەوسا لە هەموو جۆرە گژوگیاو گوڵ و گوڵزارێکی جوان جووت دەڕوێنێت".

■ لە سورەتی(النساء)دا،دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾

واتە:"ئەی خەڵکینە، لە خەشـم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن، کە ئێوەی لە تاکە نەفسێک دروستکردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدیهێناوە و لەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بڵاوکردەوە".

■ لە سورەتی(المؤمنون)دا،دەفەرموێ:﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلۡنَٰهُ نُطۡفَةٗ فِي قَرَارٖ مَّكِينٖ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقۡنَا ٱلنُّطۡفَةَ عَلَقَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡعَلَقَةَ مُضۡغَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡمُضۡغَةَ عِظَٰمٗا فَكَسَوۡنَا ٱلۡعِظَٰمَ لَحۡمٗا ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾

واتە:"سـوێند بەخوا، بەڕاسـتیی مرۆڤمان دروسـتکرد لە خولاسـە و پاڵفتەیە لە قوڕ، لەپاشـان ئەومان کرد بە نوتفەیەك لە ئارامگایەکی قایم(منداڵدانی دایك)دا، دواتر نوتفەکەمان کرد بە خوێنی مەییو، ئینجاخوێنە مەییوەکەشـمان کرد بە پارچە گۆشـتێکی جوواو، ئینجا

ئەویشمان کرد بە ئێسقان، ئینجا پەیکەرهێسکەکەمانبە گۆشتداپۆشی، پاشـــان ئەومان کرد بە دروســـتکراوێکی تر، جا گەورە و پیرۆزە ئەوخودایەی کە چاکترینی بەدیهێنەرانە".

- لە ســورەتی(آل عمران)دا، دەفەرموێ:﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝٥٩ ﴾

واتە:"بەڕاستیی وێنەی دروستبوونی عیسا لایخودا، وەک وێنەی ئادەم وایە، کە دروستی کرد لە گڵ، لە پاشـــان پێی وت ببە، ئەویش بوو".

- لــە ســـورەتی(الأعراف)دا،دەفــەرموێ:﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ۝١١ ﴾

واتە:"ســوێند بەخوا، بەڕاســتیی ئێمە باوە گەورەی ئێوەمان دروســتکردو نەخش و نیگاریرواڵەت و ڕوخســاری ئێوەمان کێشـــا، پاشـــان وتمان بە فریشـــتەکان: ئادەمیبەفەرمانیخودا،کڕنۆش بەرن بۆ ئادەم(کڕنۆشیرێز)، جا هەموو فریشـــتەکانکڕنۆشـــیان برد، جگە لە ئیبلیس،کە فەرمانیخودای شکاند و لە کڕنۆشبەران نەبوو".

# بۆچی هاتیت؟

هەڵبەت، لەو ڕۆژەوە کە مرۆڤ هاتووەتە سەر ئەم هەسارەیە، هەمیشە ئەم پرسیارە کراوە و دەکرێت، ئاخۆ مرۆڤ بۆچی هاتووەتە سەر ئەم هەسارەیە؟ بە واتایەکی دیکە، ئەرکی مرۆڤ لەسەر ئەم هەسارەیە چییە؟ ئایا تەنیا چەند ڕۆژو مانگ و ساڵێك لێرە دەگوزەرێنێت، دواتر کۆتایی پێدێت و وەك گیا هەڵدەوەرێت و دەبێت بە خۆڵ! یان ئەم مرۆڤە بە مەبەست هێنراوەتە ئەم دنیایە، بۆ ئەوەی زەویی ئاوەدان بکاتەوەو تاقی بکرێتەوە؟ئاخۆ کاری خێر دەکات یان شەڕ، ئاخۆ ڕێگەی ڕاست دەگرێتەبەر یان چەوت؟ ئاخۆ بۆ دۆزەخ کار دەکات یان بۆ بەهەشت؟ ئاخۆ بە فەرمانیخودا دەکات یان شەیتان؟

بێگومان مرۆڤەکان دوو وەڵامیان بۆ پرسیاری سەرەوە هەیە؟

❖ وەڵامی یەکەم:هی بەرەی بێباوەڕەکانە، کە بوونی مرۆڤ دەدەنە پاڵ سروشت، واتە پێیان وایە مرۆڤ لە دایکبووی سروشتە، ڕۆژێك دێتە دنیاو ڕۆژێکیش دنیا جێدێڵێت و کۆتایی پێ دێت، هەروەك قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا باسی ئەم جۆرە لە مرۆڤانەی کردووە، لەوانە:

● لە سورەتی (الجاثية)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا

كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱئْتُواْ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَـٰبِهَا ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَـٰذَا كِتَـٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَـٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٣﴾ وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَـٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٣٤﴾

واتە: "هەواڵم بدەرێ، ئایا ئەوكەسەی كە ویست و ئارەزووی خۆی كردۆتەخودای خۆی؟! بەهۆی ئەوەوە، خودایش گومڕای كردووە، كە زانیوێتی شایەنی ئەوەیە، لە ئەنجامی بەدهەڵوێستی خۆیدا و، مۆری ناوە بە دەزگای بیستن و دڵ و دەروونیداو پەردەشی هێناوە بەسەر چاوو دەزگای بینینیدا، جا ئیتر كێ هەیە جگە لەخودا، هیدایەت و ڕێنمووی بكات؟ ئایا بیر ناكانەوەو ئامۆژگاریی وەرناگرن؟ خودانەناسان دەیانوت: ژیان تەنیا ژیانینەم دنیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگارو

زەمانە کاریگەرن تیاماندا و دەمان مرێنن و هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانست و زانیارییەك ئەوە بڵێن، بەڵکو تەنیا پشت بە گومان و دوودڵی دەبەستن، کاتێکیش ئایەتەکانی قورئانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، کە بەڵگەی زۆر بەهێزو ڕوونی تێدایە لەسەر زیندووبوونەوە، هەموو بەڵگەیەکیان هاتۆتە سەر ئەوەی کە دەڵێن: دەباشە باوك و باپیرانی مردوومان بۆ زیندوو بکەنەوە، ئەگەر ڕاست دەکەن؟!

شایەنی باسە کە حەزرەتی عیسا ئەو کارەی بۆ خەڵکی ئەنجامدا، بە ویستیخودا، کەچی وتراوە: ئەمە سیحر و جادووە؟! ئەی پێغەمبەر(ﷺ)پێیان بڵێ: ئەو شتانە بەدەست ئێمە نییە، ئەوە هەرخودایە ژیانتان پێ دەبەخشێت و پاشان دەتان مرێنێت و دوای ئەوە،لە ڕۆژی قیامەتداکۆتان دەکاتەوە، کە هیچ گومانی تێدا نییە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەمە نازانن، هەرخودا خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە، ئەو ڕۆژەی کە قیامەتبەرپا دەبێت، هەر ئەو ڕۆژە هەرچی بەتاڵپەرست و ناحەق پەرستانە لە زەرەرمەندییەکی زۆر گەورەدا دەبن، ئەو ڕۆژە دەبینیت، هەموو خەڵکی بە چۆکدا هاتوون و لەسەر ئەژنۆو پەنجەکانیان ئامادەن، هەر کەس چاوەڕێی بانگکردنە بۆ لێپرسینەوە، ئامادەیە دەستبەجێڕاپەڕێت و ڕا بکات، بۆ بەردەم دادگای پڕ لە دادی پەروەردگار، هەر قەوم و هۆزێك بانگ دەکرێت بۆ لای ئەو کتێبەی کە بۆیڕەوانەکراوە، یاخود بانگ دەکرێت بۆ لای نامەی کردەوەکانی، ئەوسا پێیان دەوترێت: ئەمڕۆ ئیدی پاداشتی ئەو کاروکردەوانەی کە دەتان کرد دەدرێتەوە،

ئەمە ئیدی نامەی کردەوەکانتانە کە تۆمارمان کردووە لەسەرتان، خۆی گوایە قسە دەکات و حەق بێژە، دیارە کردەوەکانمان تۆمارکراوە لەسەر دەزگای زۆر پێشکەوتوو، چونکە بەڕاستیی ئێمە کاتی خۆی ئەوەی ئێوە دەتان کرد لەبەرمان دەگرتەوە،جا ئەو کاتە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە،وە کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، ئەوە پەروەردگاریان دەیانخاتە ژێر سایەیڕەحمەت و میهرەبانی خۆیەوە، تەنیا ئەوە سەرکەوتن و سەرفرازیەکی ئاشکرایە،بەڵام ئەوانەی کە بێباوەڕ وکافر بوون، پێیان دەوترێت: باشە، ئێوە ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێنرایەوە؟! کەچی خۆتان بەگەورەو زل دەزانی، بەڕاستیی ئێوەهۆزێکی تاوانبارو تاوانکار بوون، کاتێکیش بوترایە: بێگومان بەڵێنیخوداڕاستە و ڕۆژی قیامەت هەر دێت و گومانی تیادا نییە، ئێوە لە وەڵامدا دەتانوت: ئێمە هەر نازانینڕۆژی قیامەت چییە؟! ئێمە هەر گومان دەبەین و دڵنیا نین! ئەو کاتە لە قیامەتدا، ئەو کاروکردەوە ناشیرینانەی کە کردوویانە بۆیان دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت، ئەوەش کە گاڵتەیان پێدەکردو باوەڕیان پێی نەبوو،کە سزاو ئازاری دۆزەخە، لە هەموو لایەکەوە دەوریان دەدات و ڕێگەیڕزگارییان لێ دەبڕێت،پێیان دەوترێت: لەمڕۆ بەدواوە، ئیدی ئێوە فەرامۆش دەکەین و پشتگوێتان دەخەین، هەروەك چۆن ئێوە باوەڕهێنان بەم ڕۆژەتان فەرامۆش کرد، شوێنی نیشتەجێ و حەوانەوەشتان ناو ئاگری دۆزەخە، کەسیشتان دەست ناکەوێت پشتیوانی و پشتگیریتان لێ بکات".

■ له سورەتی(المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَامًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾

واتە:"ئایا هەڕەشـــەتان لێدەکات بەوەی کاتێك بمرن و ببنەوە بە خاك و ئێسك، ئێوە زیندوودەکرێنەوە و لە خاك دەردەهێنرێنە دەرەوە"؟!

دوورە و زۆر دوورە ئەو هەڕەشـــەیەی کە لێتـان دەکرێت بێتە دی و (زیندووبکرێنەوە)!

ژیان تەنها ژیانی ئەم دنیایەمانەو هیچی تر نییە، دەژین و دەمرین و ئێمە زیندوو ناکرێینەوە"!

●له سورەتی(یونس)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا وَرَضُوا بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاطْمَأَنُّوا بِهَا وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ آيَاتِنَا غَافِلُونَ ﴿٧﴾ أُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمُ النَّارُ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾ ﴾

واتە:"بەڕاســتیی ئەوانەی بەهیوای دیداری ئێمە نین لە دواڕۆژدا و، ڕازی بوون بە ژیانی دنیاو دڵنیابوون پێی، وە ئەوانەی بێئاگان لە ئایەتەکانی ئێمە، ئەوانە جێگایان دۆزەخە لەبەر ئەو کردەوانەی کە لە دنیادا دەیانکرد".

●له سورەتی(التغابن)دا دەفەرموێ: ﴿ زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ ﴾

واتە:"ئەوانەی بێباوەڕ بوون، بە بۆچوونی خۆیان وتیان:هەرگیز زیندوو ناکرێینەوە، پێیان بڵێ: وا نییە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستیی هەر زیندوو دەکرێنەوە، پاشـــان ئاگادار دەکرێنەوە لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی، کە ئەنجامتان دەدا، ئەوەش بۆخودا زۆر ئاسان و سادەیە".

■ لە سورەتی(الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٥١﴾ ﴾

واتە:"ئەوانەی کەکاتی خۆی ئایینەکەیان بەگەمەو گاڵتە گرتبوو، ژیانی دنیا غەڕاو سەرگەرُدانی کردبوون و خەڵەتاندنی، جا ئێمە ئەمڕۆ ئەوانە فەرامۆش دەکەین، هەروەکو ئەوان ئەم ڕۆژەیان فەرامۆش کردو لەبیر خۆیان بردبۆوە، هەروەها بەهۆی ئەوەشـــەوە کە دژی ئایەتەکانی ئێمە دەوەستان و نینکاری و بەربەرەکانییان دەکرد".

■ لە سورەتی(الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُواْ يَٰحَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ ﴾

واتە:"بەڕاســـتیی ئەوانەی کە باوەڕیان بەئامادەبوونی بەردەم دادگایخودایی نەبوو، زەرەریان کردو خۆیان دۆڕاند،کاتێکیش قیامەت کتوپڕ یەخەیان پێدەگرێت، دەڵێن: ئاخ و داخ وپەشـــیمانی بۆ ئەو ڕۆژگارەی بەکەمتەرخەمی و بەڕەڵایی و سەرکەشی و تاوانبردمانەسەر،

لەکاتێکدا، ئەوانە هەموو تاوان و گوناهیان داوە بەکۆڵیاندا، ئاگاداربن کە چەندە خراپە، کۆڵ و باری وا، کە هەڵی دەگرن".

● لە سورەتی(المدثر)دا دەفەرموێ:﴿ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصْحَـٰبَ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِى جَنَّـٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾ ﴾

واتە:"چونکە لە قیامەتدا هەموو کەس بارمتەی دەستپێشخەری خۆیەتی، کردەوەکانی دێنەوەرێی، جگە لە دەستەیڕاستان و ئیماندارانی کردەوە چاك، لەناو بەهەشتەکاندان و پرسیار لە تاوانبارانەکەن،ئەوە چی بوو ئێوەیراپێچی دۆزەخ کرد؟! بە کەساسییەوە دەڵێن: ئێمە لە نوێژگەران نەبووین، واتە، نوێژمان بەرپا نەدەکرد، هەروەها خۆراکمان بە هەژاران نەدەبەخشی،هەمدیس ئێمە لەگەڵزماندرێژو بێ ئابڕووەکاندا قسەی خۆمان دەکردو لە بابەتی ئەوانمان دەگوت و ڕەخنەی بێجێمان دەگرت، لەگەڵیانڕۆدەچووین، ئێمە باوەڕمان بە ڕۆژی پاداشت نەبوو، هەتا مردن یەخەی پێگرتین و ڕۆژگاری تەمەنمان کۆتایی هات".

■ لە سورەتی(النجم)دا، دەفەرموێ:﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ﴾.

واتە:"جا کەوابوو پشت هەڵکە لەوەیڕووی وەرچەرخاندووە لە قورئانی ئێمەو، جگە لەژیانی ئەم دنیایەش هیچی تری ناوێ".

•لـه سـوورەتی(المؤمنون)دا، دەفـەرموێ:﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾.

واتە:"بە ڕاسـتیی ئەوانەی باوەڕ بە قیامەتناهێنن، وێڵ ولادەرن لە ڕێگەوڕێبازیڕاست".

•لە سورەتی(هود)دا، دەفەرموێ:﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْآخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٩﴾ ﴾

واتە:"كێ لەوە سـتەمكارترە، كە درۆ بەناویخوداوە هەڵببەسـتێت؟ بەوەی کە بڵێ: خودا هاوەڵ یان كوڕی هەیە! ئەوانە نیشـانی پەروەردگاریان دەدرێن و شایەتەكانی قیامەت، كە فریشتە و پێغەمبەران و بانگخوازانن، دەڵێن: ئا ئەوانە، ئەوانەن كە درۆیان كرد بەدەم پەروەردگاریانەوە؟ئاگاداربن! نەفرەتیخودا لەسـەر سـتەمكارانە،ئەوانەی بەنەرم و نیانی و لەسـەرخۆ بەرهەڵسـتی پەیامیخودا دەكەن و بەلاری دەیانەوێت و دەیانەوێت بە هەڵەو ناتەواوی بیناسـێنن بەخەڵكی و ئەوانە باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نییە".

▪ لە سورەتی(الحج)دا، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِى ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ

أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ ﴿٥﴾ ﴾

واتە:"ئەی خەڵکینە، ئەگەر ئێوە گومانتان لە زیندووبوونەوە هەیە، ئەوە چاك بزانن، کە ئێمە سەرەتا ئێوەمان لەخاك و خۆڵ دروستکردووە، لەوەودوا ئەوەکان لە نوتفەیەك پەیدا بوون، پاشـــان نوتفەش دەبێتە خۆهەڵواسەرێك لەناو منداڵداندا، لەوەودوا دەبێتە گۆشتپارەیەکی تەواو ســەرو ســیمادار،یان ناتەواو، هەموو ئەم شـــتانە دەهێنینەوەیادتان، تا بۆتانڕوون بکەینەوە، کە ئێمە ئاوا ئێوەمان دروســـتکردووەو دووبارە دروســتکردنەوەشـتان لامان ئاسـانە، ئەوەش بمانەوێت لە منداڵدانەکاندا جێگیری دەکەین، تا کاتێکی دیاریکراو، لەوەودوا بەســـاوایی و بەبچووکیلە ســکی دایکتاندەرتاندەهێنین، دوایی بۆ ئەوەی گەورە ببن و بگەنە ئەوپەڕی هێزو تواناتان، هەتانە بەگەنجیدەمرێنرێت، هەشـــتانە دەگەڕێنرێتەوە بۆ پەرپووتترینی تەمەنەکان، بۆ ئەوەی هیچ شـــتێك نەزانێت، دوای ئەوەی جاران دەیزانی،بەڵگەیەکی تریش لەســــەر زیندووبوونەوە ئەوەیە کە ئەی ئینسان: تۆ زەویش دەبینیت وشك و برنگە، جا کاتێك ئاوی بارانمان بەســـەردا باراند، دادەچڵەکێت و دەلەرزێت و تۆوەکان چەکەرە دەکەن و ڕەگ و چڵ دەردەکەن و دەڕوێن، ئەوسـا لە هەموو جۆرە گژوگیاو گوڵ وگوڵزارێکی جوان جووت دەڕوێنێت".

• له سورەتی(یس)دا، دەفەرموێ:﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥۖ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾

واتە:"نموونەی لاوازیی و بێدەسەڵاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوەو بەدیهاتنی خۆی لەبیرکردووە، دەیوت: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە؟ لە کاتێکدا کە ڕزیوو و پڕۆکاون؟ اپێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر ئەویش زیندووی دەکاتەوە، ئەو بەهەموو دروستکراوێک زاناو ئاگایە، دروستکردن و دروستکردنەوەی هەموو شتێکی لا ئاسانە".

❖ وەڵامی دووەم:هی بەرەی باوەڕدارەکانە، ئەو باوەڕدارانەی باوەڕیان بە پەرتووکەکانیخودا هێناوە، کە لە ئاسمانەوە لە ڕێگەی حەزرەتی (جبرپیل)ەوە بە سرووش(وەحی)، ناردوویەتی بۆ سەر پێغەمبەرەکانی(درووديخودايان لەسەر بێت)، تاکو ئادەمیزادبەرەو ڕێگەی هەق و ڕاستیی ئاراستە بکەن، هەروەها دووری خەنەوە لە ڕێگەی چەوت و ناڕاست.

هەڵبەت،خودای گەورە،لە گشت پەرتووکەکانیدا، نەخاسمە لە قورئاندا، باسی لە هۆکاری دروستبوونی مرۆڤ کردووە! واتە، بەیانی کردووە، کە مرۆڤ بۆچی دروستکراوە و، ئەرك و کاری لەسەر هەسارەی زەوی چییە، هەروەها دەبێ لە دنیا چی بکات و چی نەکات؟

بەپێی بەڵگە قورئانییەکان، دروســـتبوونی مرۆڤ بۆ (٤) هۆکار دەگەڕێتەوە:

### ١. بۆخوداپەرستی و عیبادەت:

گەورەترین حیکمەتی دروســـتکردنی مرۆڤ لەم دنیایە، بریتییە لەخوداپەرستی و عیبادەت. چونکە بۆ ئەو مەبەستە دروستکراوە و لە زەویی نیشـــتەجێ کراوە، تاکوخودا بپەرســـتێ و فەرمانەکانی جێبەجێ بکات.

خوای گەورە لەمبارەیەوە لە ســـورەتی(الذاريات)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾

واتە:"بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروســـت نەکردووە، تەنیا بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن وفەرمانبەردارم بن".

### ٢. بۆ ئەوەی مرۆڤ زەویی ئاوەدان بکاتەوە:

حیکمەتێکی دیکەی دروســـتکردنی مرۆڤ لەســـەر ئەم هەســـارەیە، بریتییە لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی! واتە: ئەرکی مرۆڤلەم دنیایە، تەنیا لەخوداپەرســـتیدا چڕ نابێتەوە، بەڵکو دەبێ دنیاش ئاوەدان بکاتەوە و ببێتە مایەی خێر و خۆشـــی،هەم بۆ خۆی، هەمیش بۆهەموو بوونەوەر بە گشتی، بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستەش، پێویستە لە کاروباری ئەم دنیایەدا شارەزا بێت، تا بتوانێ ئاوەدانی بکاتەوە.

خوای گەورە لەمبارەیەوە لە سورەتی(هود)دا، دەفەرموێ: ﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا ﴾ (٦١)

واتە: "خودا، ئێوەی دروستکردووە لە زەویداو کردوونی بە ئاوەدانکەرەوە تێیدا".

## ٣. بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤ، ئاخۆ خێر هەڵدەبژێرێت یان شەڕ:

حیکمەتێکی دیکە لەو حیکمەتانەی کە مرۆڤ لە پێناویدا دروستکراوە، بریتییە لە تاقیکردنەوە، واتە، لە دنیا تاقی دەکرێتەوە، ئاخۆ خێر هەڵدەبژێرێت یان شەڕ، ڕاست هەڵدەبژێرێت یان چەوت، باش هەڵدەبژێرێت یان خراپ، فەرمانی خوداجێبەجێ دەکات، یان فەرمانی شەیتان، لەسەر نەخۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان سەبر و ئارام دەگرێ، یان ناسوپاسی دەکات و نیعمەتەکانی خودا نادیدە دەگرێت!

خودای مەزن لەمبارەیەوە لە سورەتی (الملك)دا، دەفەرموێ: ﴿ تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ (١) ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ (٢) ﴾

واتە: "گەورەو موبارەك و پیرۆزە، ئەو زاتەی کە هەموو بوونەوەرو جیهانی بەدەستە، ئەو زاتەی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە،هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدیهێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە، ئاخۆ کردەوەیکامەتانچاکترو پەسەندترە، هەر ئەویش زاتێکیباڵادەستە بەسەر بێباوەڕاندا، وە لێخۆشبووە لە ئیمانداران".

هەروەها لە سورەتی(الإنسان)، دەفەرموێ:﴿ إِنَّا خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٍ أَمۡشَاجٖ نَّبۡتَلِيهِ فَجَعَلۡنَٰهُ سَمِيعَۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ ﴾

واتە:"بێگومان ئێمە ئینسانمان دروستکرد لە تێکەڵەیەك، لە سەرەمێکوتەیەکی بچووك و هێلکۆکەیەك، لە کاتێکدا دەمانەوێت تاقی بکەینەوە، هەر بۆیە دەزگای بیستن و بینینمان پێبەخشی".

هەروەهالە سورەتی(آل عمران)دا، دەفەرموێ: ﴿ لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ وَلَتَسۡمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗاۚ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴿١٨٦﴾ ﴾

واتە:"سوێند بێت، بێگومان تاقی دەکرێنەوە لە ماڵ و دارایی و گیانی خۆتاندا، زیان لە ساماندا دەکەن، خۆتان دووچاری ناخۆشی و ئازار دەبن، هەروەها سوێند بێت،ئازارێکی زۆرلە خاوەنانیکتێبی پێش خۆتان و لە موشریک و هاوبەشدانەران دەبیستن،ئەوان، ئەوەندە بوختان و قسەی نابەجێتان بۆ هەڵدەبەستن، وەک ئازار بەرگوێتان بکەوێت وایە،بەڵام ئەگەر خۆڕاگر بن و پارێزکار بن و لە خودا بترسن، لە سنوور دەرنەچن، بەڕاستیی ئەو هەڵوێستە لەکارە پەسەندو کردەوە پایەدارەکانە".

هەمدیس لە سورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ:﴿ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾

ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾

واته: "سوێند بەخوا، تاقیتان دەکەینەوە بە هەندێک لە ترس و برسێتی و کەمبوونی ماڵ و دارایی و خەڵکی (کەسوکارتان) و بەروبووم، جا مژدە بدە بە خۆڕاگران، ئەوانەی کە دووچاری سەختییەک (موسیبەتێك)بوون، دەڵێن: ئێمە هەر هی خوداین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە، ئا ئەوانە دروودو بەزەیی لەلایەن پەروەردگاریانەوەبەسەریاندا دەبارێ و، ئەوانە ئەو کەسانەن، کە هیدایەتیان وەرگرتووە".

## ٤. بۆ ئەوەی مرۆڤ ئازاد و سەربەست بێت:

حیکەتێکی دیکە لەو حیکەتانەی کە مرۆڤ لەو پێناوەدا خەلقکراوە، بۆ ئەوەیە مرۆڤ ئازاد و سەربەست بێت و ئازاد بێت لە هەڵبژاردنی هەر بیروباوەڕێك و ئایدۆلۆژیایەك کە خۆی بییەوێت.

چونکە ئەگەرخودا بیویستایە، ئەوا هەموو مرۆڤەکانی دەکرد بە یەك دەست و تاقم و خاوەن یەك بیروباوەڕ، بەڵام ئەمەی جێهێشتووە بۆ مرۆڤ، بۆ ئەوەی خۆی ئازاد بێت لە هەڵبژاردنی هەر جۆرە بیروباوەڕێك، کە خۆی بییەوێت پەیڕەوی بکات!

خوای مەزن لەمبارەیەوە لە سورەتی (هود)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخۡتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَۚ

وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْۗ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾﴾.

واتە:"خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوە هەموو خەڵکی دەکرد بەیەك تاقم و كۆمەڵ،بەڵام بەردەوامیش ئەو خەڵكە جیاوازن لە نێوانییەكتردا لە ئایین و بەرنامە و بۆچووندا، مەگەر ئەوەی بەزەیی پەروەردگارت گرتبێتیەوە، هەر بۆ ئەو مەبەستەشخودایگەورە دروستی كردوون، واتە، بەشێوەیەك دروستی كردوون، بتوانن ئازادیی بیروباوەڕو بۆچوونیان هەبێت، ئینجارێگەیڕاستیان پێ بڵێت و بۆیانڕوون بكاتەوەو بڕیاری پەروەردگاری تۆ دەرچووە و تەواو بووە،كە: دۆزەخ پڕ دەكەم لەگرۆی پەریو خەڵكی، ئەوانەی خۆیان شایستەی ئاگر دەكەن".

هەروەهاخودای مەزن لەمبارەیەوە لە سورەتی (الانسان)دا، دەفەرموێت:﴿ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾

واتە:"بەڕاستیی ئێمەڕێنموییمان كرد بۆڕێگەیڕاست، بە ئازادیی دەتوانێتببێتە كەسایەتیەكی ئیماندارو سوپاسگوزار، یان بێباوەڕوخودانەناس".

هەمدیس لە سورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ:﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَيِّۚ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾﴾

واتە:"بەهیچ جۆرێك زۆركردن نییە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا، دینداری بەزۆر نابێت بكرێت و دین بەزۆر نادرێت بەسەر

کەسـدا، چونکە بەڕاسـتییرێبازی چاک و دروسـت؛ ڕوون و ئاشـکرا بووەو جیابۆتەوە لە گومڕایی و سـەرکەشـی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە(تاغوت)،کە بریتییە لە هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامە و لادان و بتێک. هەروەها باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخودا، جا بێگومان ئەوکەسە دەسـتی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاریرزگارییەوە، شـوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هیچ پسـان و هەڵوەشـاندنەوەیەکی بۆ نییە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە،خودای گەورەش بیسەرو زانایە".

# تۆ بۆ کوێ دەچیت؟

پرســــیارێکی دیکەی گرنگ، کە هەمیشــــە مرۆڤی بە خۆیەوە ســــەرقاڵکردووە و لە گرێیەکانیدا دەزرینگێتەوە، ئەوەیە کە دەڵێت: دوای مردن، بۆ کوێ دەچم؟ چارەنووسم چی لێ دێت، ئاخۆ زیندوو دەکرێمەوە، یان نا؟

بۆ وەڵامی ئەم پرســــیارەش، هەر لە دێر زەمانەوە، مرۆڤەکان بەســــەر دوو بەرەی دژ بە یەکدا دابەشبوون.

بەرەیـەك، کە بە بەرەی بێباوەڕان(مولحیدان) ناســــراوە، پێی وایە، نەخوداهەیە(پەنا بەخوا)، نە ڕۆژی پەســــەڵان(هەســــتانەوە) و هەق و حیســـاب و دۆزەخ و بەهەشــتیش هەن، چونکە بوونی مرۆڤ دەدەنە پاڵ سروشت، واتە، پێیان وایە مرۆڤ بەرهەمی سروشتە، کەواتە مرۆڤ وەك گیا وایە، کە وشك بوو(مرد)، ئیدی کۆتایی پێ دێت و دەبێتە بەشێك لە سروشت و مێژوو و تا ئەبەد زیندوو نابێتەوە!

## عەقیدەی بەرەی (بێباوەڕان)

خودای مەزن، لە قورئانی پیرۆزدا، بەم شـێوەیە باس لەبەری بێباوەڕان دەکات:

- لە سورەتی(الجاثیة)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾.

واتە:"خوانەناسـان دەیانوت: ژیانتەنیا ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگارو زەمانە کاریگەرن تیاماندا و دەمانمرێنن و هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەسـەر بنچینەی هیچ جۆرە زانسـت و زانیارییەك ئەوە بڵێن، بەڵکوتەنیا پشت بەگومان و دوودڵی دەبەستن".

- لە سورەتی(المؤمنون)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَـٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَـٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

واتە:"جا ئەگەر ملکەچ و فەرمانبەرداری بەشـەرێکی وەکو خۆتان ببن، ئەوە بە ڕاسـتیی ئیتر ئێوە خەسـارەتمەند و زەرەرمەندن!! ئایا هەڕەشـەتان لێدەکات بەوەی کاتێك بمرن و ببنەوە بە خاك و ئێسـك، ئێوە زینـدوو دەکرێنـەوە و لـە خـاك دەردەهێنرێنـەوە؟! دووره و زۆر دووره ئـەو هەڕەشـەیەی کە لێتان دەکرێت بێتە دی وزیندوو بکرێنەوە! ژیانتەنیا

ژیانی ئەم دنیایەمانە و هیچی تر نییە، دەژین و دەمرین و ئێمە زیندوو ناکرێینەوە"!

●لە سورەتی(الأنعام)دا، دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوٓاْ إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ قَالَ أَلَيۡسَ هَٰذَا بِٱلۡحَقِّۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٣٠﴾ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ قَالُواْ يَٰحَسۡرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطۡنَا فِيهَا وَهُمۡ يَحۡمِلُونَ أَوۡزَارَهُمۡ عَلَىٰ ظُهُورِهِمۡۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَعِبٞ وَلَهۡوٞۖ وَلَلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٣٢﴾﴾

واتە:"ئەوانە وتیان: ژیان هەر ئەم ژیانەی دنیایە و هیچی تر نییە، ئێمە بۆ لێپرسینەوەزیندوو ناکرێینەوە، جا ئەگەر کاتێک ئەوانە دەبینیتلەبەردەم دادگای پڕ لە دادی پەروەردگاریاندا وەستێنراون،خودای گەورە پێیان دەفەرموێت: ئایا ئەمەی کە بۆتان پێشهاتووەو دەیبیننڕاست و هەقیقەت نییە؟ بەکەساسی و خەجاڵەتییەوە دەڵێن: بەڵێسوێند بە پەروەردگارمان ئەوەڕاستە، ئینجاخودا دەفەرموێت:مادەم وایە، سزا و تاڵاو بچێژن بەهۆی بێباوەڕی و یاخیبوونتانەوە، بەڕاستیی ئەوانەی کە باوەڕیان بەئامادەبوونی بەردەم دادگایخودایی نەبوو، زەرەریان کردو خۆیان دۆڕاند،کاتێکیش قیامەت کتوپڕیەخەیان پێدەگرێت، دەڵێن: ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو ڕۆژگارەی بەکەمتەرخەمی و بەڕەڵایی و سەرکەشی و تاوان بردمانەسەر، لەکاتێکدا، ئەوانە هەموو تاوان و گوناهیان داوە بەکۆڵیاندا، ئاگاداربن کە چەندە خراپە، کۆڵ و باری وا، کە هەڵی

دەگرن، ژیانی دنیا جگە لە یاری و گەمە و گاڵتەیەکی کەم نەبێت، هیچی تر نییە، بێگومان ماڵی دوایی (بەهەشـــتی بەرین)، چاکترە بۆ ئەوانەی کە پارێزکاری وخوداناســـی دەکەن، ئایا ئەوە بۆچی عەقڵ و ژیریتان ناخەنە کار و ژیر نابن"؟!

●لە سورەتی(یس)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾

واتە:"بێباوەڕان: بە گومانەوە ڕوو بەئیمانداران دەڵێن: باشـــە، ئەگەر قیامەت و لێپرسینەوەڕاستە، کەی ئەو کاتە دێت، ئەگەر ڕاست دەکەن؟!

ئەوانەتەنیا چاوەڕێییەك شـــریخە و دەنگێکی زۆر گەورەی ســـامناك نەبێت، چاوەڕێی هیچی تر ناکەن، کە هەموویان دەپێچێتەوە و، کۆتایی بە ژیانیان دەهێنێت، لەکاتێکدا کە ســـەرگەرمی کاروباری دنیای خۆیانن، سەرگەرمی کێشە و بەربەرەکانێی ناحەقن.

ئەوسا ئیتر نە دەتوانن ڕاسپاردەیەك بگەیەنن، نە دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵیان، چونکە هەموویان لەناوچوون، هەموویان خامۆش بوون.

پاشان هەر کە فوو دەکرێت بە(صور)دا، دەستبەجێ خێرا هەموویان لە گۆڕەکانیان لە توێی خاکەوە بەپەلە دێنە دەرەوە بۆ لای پەروەردگاریان، کەس ناتوانێت سەرپێچی بکات، یان خۆی بدزێتەوە.

بە سەرسامییەکی زۆرەوە دەڵێن: ئەی هاوارا ئەوە کێ ئێمەی زیندوو کردەوە؟ کێ ئێمەی لە شوێنیڕاکشانمان لە گۆڕەکانمان دەرهێنا؟ئەوسا ئیمانداران،یان فریشتەکان، یان خودای گەورە، خۆی دەفەرموێت: ئائەمە بەڵێنی خودای میهرەبانە و پێغەمبەرانیش لە هەواڵدانی ئەو ڕۆژەڕاستیانکردووە.

لەوماوەیەدا هیچڕوونادات، جگەلە دەنگێکی گەورەی کوتوپڕ نەبێت، جادەستبەجێ هەموویان لای ئێمە ئامادەکراون.

ئینجا ئەم جارە دەدرێت: ئەمڕۆبەهیچ شێوەیەك،ستەم لە هیچ کەسێك ناکرێت، خەڵکینە دڵنیابن کەتەنیا پاداشتی کارێك دەدرێتەوە کە دەتانکرد".

●لە سورەتی(یونس)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ۚ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُهُۥ بَيَٰتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم

بِهِۦٓ ءَآلْـَٔـٰنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٥٢﴾﴾

واتـه:"بێبـاوەڕان دەڵێن: كوا، كـەی ئـەو بـەڵێنـەدێتەجێ؟ كـەیڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێت؟ ئەگەر ئێوەڕاست دەكەن؟!

پێیان بڵێ:منتەنیا پێغەمبەرم، توانای ئەوەشـــم بەردەســـت نییە، كە زەرەرێـك، یـان قـازانجێـك بـە خۆم بگـەیـەنم، مـەگـەر ئـەوەی كـە ویســـتیخودای لەســـەر بێت، هەموو قەومێك كاتی دیاریكراوی خۆی هەیە بۆ كۆتـایی هاتنی، هـەر كاتێك ئەو ســـاتە گەیشـــت، ئەوا نەتاوێك دوادەكەون، نەساتێكیش پێش دەكەون.

بڵێ: هەواڵم بدەنێ، باشـە ئەگەر سزاو تۆڵەیخودا لەشـەوگاردا،یان لە ڕۆژگاردایـەخەی پێگرتن، تـاوانبـارانبـەتەمای چین؟! ئاخۆ بۆچی پەلە دەكەن؟!

دوای ئـەوە، ئـایـا كـە قیـامـەتڕوویداو بەرپابوو، باوەڕی پێ دەهێنن؟!. ئەوســا پێیان دەوترێت: ئا ئێســـتا باوەڕی پێ دەهێنن؟! خۆ بەڕاســـتیی كاتی خۆی بەگاڵتە پێكردنەوە، پەلەتان دەكرد لە پێش هاتنی و باوەڕتان پێی نەبوو!

ئەوسا بەوانەی كە ستەمیان لە خۆیانكرد دەوترێت: دەی بچێژن سزاو ئـازاری نـەبڕاوە، مـەگـەر پـاداشـــتتـان لـەبـەرامبـەری كـارو كردەوە و هەوڵەكانی خۆتانەوە نادرێتەوە، كە دەتانكرد"؟!

●له سـورەتی(النحل)دا،دەفەرموێت:﴿ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٠﴾ ﴾

واتە:"سیفەت و ناونیشانی ناشیرین و نزم و خراپ شایستەی ئەوانەیە کە باوەڕ بە قیامەت ناکەن،خودای پەروەردگاریش خاوەنی هەموو سیفاتی بەرزو بڵندو پیرۆزەو ئەو زاتە هەر خۆیشی باڵادەست و دانایە".

●له سورەتی(النساء)دا، دەفەرموێ:﴿ وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ ۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا ﴿٣٨﴾ ﴾.

واتە:"ئەوانەش کە ماڵ و سامانیان بۆڕووپامایی خەڵکی دەبەخشن، نە باوەڕ بە خودا دەهێنن، نە بەڕۆژی دوایی، دیارە کە شەیتان ئەوانیلە خشتە بردووەو کردوونی بەهاوەڵی خۆی، جا ئەوەی شەیتان بکاتە هاوەڵ و هاودەمی خۆی، مەگەرخودا بزانێت، چ ناپوخت و نالەبارێکی کردۆتە هاوەڵی خۆی".

●له سـورەتی(التغابن)دا،دەفەرموێ:﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن لَّن يُبْعَثُوا۟ ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ ﴾

واتە:"ئەوانەی بێباوەڕ بوون، بە بۆچوونی خۆیان، وتیان: هەرگیز زیندوو ناکرێینەوە، پێیان بڵێ: وا نییە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستیی هەر زیندوو دەکرێنەوە، پاشـان ئاگادار دەکرێنەوە لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا، ئەوەش بۆخودا زۆرئاسان و سادەیە".

- له ســـورەتی(المؤمنون)دا،دەفەرموێ:﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾

واتە:"بە ڕاستیی ئەوانەی باوەڕ بە قیامەت ناهێنن، وێڵ و لادەرن لە ڕێگەوڕێبازیڕاست".

- هەر لە سورەتی (المؤمنون)دا، خودای گەورە لەبارەی بێباوەڕانەوە دەفەرموێ:﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾ بَلْ قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓا۟ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾

واتە:"ئەو زاتەشـــە، کە ژیان دەبەخشـــێت و مردن پێش دەهێنێت، گۆڕینی شـــەوو ڕۆژیش هەر بەدەســـت ئەوە ، لە ڕووی تاریکی و ڕووناکی، کورتی و درێژی و ...هتد. جا ئایا ئێوەبۆچی عەقڵ بەکار ناهێنن و ژیریتان ناخەنەکار؟!

لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا، ئەوانە هەر وەکو خەڵکی پێشـین، قسـە کۆنەکان دەڵێنەوەودەڵێن: باشـــە، ئەگەر مردین و بووینە خاك و خۆڵ و ئێسك، ئایا ئێمە دووبارە زیندوو دەکرێینەوە؟!

بـەڕاســـتیی پێشـــتریش لەم جۆرە بەڵێنـانە، بە ئێمـەو بـاب و باپیرانماندرابوو، ئەم قسەو بەڵێنانە داستانی پێشینەکانە"!

● له سـوره‌تی (النمل)دا، ده‌فه‌رموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾

واتـه: "بێگومـان ئـه‌وانـه‌ی بـاوه‌ڕ بـه قیـامـه‌ت نـاهێنن، کـاروکرده‌وه خراپه‌کانمان له‌به‌رچاو جوان کردوون، له‌به‌ر ئه‌وه چاوی دڵیان کوێر بووه، خراپی کرداره‌کانیان نابینن".

## عەقیدەی بەرەی باوەڕداران

هەڵبەت، عەقیدەی بەرەی دووەم، کە بە بەرەی(باوەڕداران) ناســـراوە، تەواو پێچەوانەیعەقیدەی بەرەی بێباوەڕانە، چونکە ئەم بەرەیە، باوەڕێکی تەواو و پتەوی بەخودا و فریشـــتەکان و پەرتووکە ئاســـمانییەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی هەیە و، باوەڕی وایە کە ئەم ژیانە، تەنیا قۆناغێکە، مرۆڤ بۆ ماوەیەك تێیدا دەمێنێتەوە، ئینجا بەرەو قۆناغی بەرزەخ دەڕوات، کە قۆناغی دوای مردنە، ئینجا قۆناغی هەستانەوە(هەق و حیســـاب)، بەدوایدا دێت، ئینجا قۆناغی کۆتایی دێت، کە بریتییە لە دیاریکردنی چارەنووسی مرۆڤ، ئاخۆ بەرەو بەهەشت دەچێت یان دۆزەخ! خوای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا، لە چەندین شـــوێن، باســـی لە بەرەی باوەڕداران کردووە، کە باوەڕیان بەخودا و هەستانەوە و هەق و حیساب و دۆزەخ و بەهەشت هەیە.

بۆ نموونە، هەندێ لەو ئایەتانە دەخەینە ڕوو:

- لە سورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ ﴾

واتە:"پێغەمبەرو ئیمانداران، باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتەخوادارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بەخوداوفریشـــتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی، دەڵێن هیچ جۆرە

جیاوازییەک ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانیخودادا، لە باوەڕدا.

هەروەها وتیان: گوێڕایەڵ و ملکەچین بۆ بەدیهێنەرمان، پەروەردگارا لێخۆشبوونی تۆمان دەوێت و سەرئەنجام گەڕانەوە هەر بۆ لای تۆیە".

●لە سورەتی(النساء)دا، دەفەرموێت:﴿ لَّـٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ۚ وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أُو۟لَـٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾ ﴾

واتە:"بەڵام ئەوانەیان کە لە زانســــت و زانیاریدارڕۆچوون، هەروەها ئیمانداران، لەوانیش و لەئێمەیش، باوەڕ دەهێنن بەوەی بۆ تۆڕەوانەکراوەو بەوەش پێش تۆڕەوانەکراوە، بەتایبەت ئەوانەی کە بەچاکی نوێژەکانیان بەدروشــمەکانەوە ئەنجام دەدەن و زەکاتیش دەدەن، باوەڕیشــیان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئا ئەوانە لە ئایندەیەکی نزیکدا پاداشــتی گەورەو بێ سنووریان دەدەینەوە".

●لە سورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَـٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ

وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ ﴾

واتـە:"ئـەی ئـەوانـەی ئیمـان و بـاوەڕتـان هێنـاوە، داوای کۆمـەك و یـارمـەتییلـە خودا بکـەن، بـەهۆی ئـارامگرتن و نوێژکردنـەوە، دڵنیـابن کەخودایاروپاوەری خۆگرو ئارامگرانە، جا هەرگیز بەو کەســـانە مەڵێن مردوون،کە لە ڕێیخودادا دەکوژرێن و شـەهید دەبن. نەخێر ئەوانە زیندوون، بەڵام ئێوە هەســـت بە زیندوویەتی ئەوان ناکەن. ســـوێند بەخوا تاقیتان دەکەینەوە بە کەمێك لە ترس و بیم و برسێتی و کەمبوونی ماڵ و سامان و مردنی کەسوکارو تیاچوونی بەرو بوومی کشتوکاڵ، جا مژدە بدە بەو کەســـانەی خۆگرو ئارامگرن، کە ئەوانەن هەر کاتێك تووشـــی بەڵاو نـاخۆشـــییـەك دەبن، دەڵێن: ئێمـە موڵکیخوداین و هـەرچی هـەمـانـە بەخشـشـیخودایە، ســەرئەنجامیش، گەڕانەوەمان هەر تەنیا بۆ لای ئەو زاتەیە".

●لە سورەتی(الفرقان)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ ﴾

واتە:"بەندەکانیخودای میهرەبان، ئەو کەســانەن، کە زۆر بە هێمنی و سـەلاری بەسـەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش نەفامان بە قسـە و قسـەڵۆکی نـاخۆش بـەرەنگـاریـان دەبنەوە، لـە وەڵامیاندا دەڵێن: ســـلاو، ڕەوشـــت

بەرزیخۆیان دەنوێنن.ئەوانەی کە شەوگار بۆ پەروەردگاریان بە سوژدە و وەستاون و نوێژ دەبەنەسەر.ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا، لەسزای ئاگری دۆزەخ بەدوورمان بکە و پەنامان بدە، چونکە سزاو ئازاری لە کۆڵ نابێتەوە و بەردەوامە بۆ ئەوکەسەیخودانەناس و یاخییە".

•لە سورەتی(النمل)دا، دەفەرموێ:﴿ طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ﴿١﴾ هُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٣﴾ ﴾

واتە:"سەرنجی سەرەتای سورەتی(البقرة) بدە، ئەوە ئایەتەکانی ئەم قورئانەن و فەرمانی کتێبێکی پیرۆزو ئاشکرا و ڕوونە.
هیدایەتبەخش و مژدەبەخشە بە ئیمانداران، لە هەموو سەردەمێکدا.
ئەوانەی کە نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجامدەدەن و زەکات دەبەخشن و باوەڕێکی بەتین و دامەزراویان بە ڕۆژی قیامەت هەیە".

•لە سورەتی(العنکبوت)دا، دەفەرموێ:﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَحۡسَنَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٧﴾ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَآۚ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٩﴾ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ نِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾ (٥٧)

واتـە:"ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوهۆکاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، بەڕاستیی هەڵە وگوناهەکانیان دەسڕینەوە و بەچاکتر لەوەی کە دەیانکرد پاداشـــتیان دەدەینەوە،ئێمە فەرمانمانداوە بە ئادەمیزاد، کە چاکڕەفتار بێت لەگەڵ دایکو باوکیدا، خۆ ئەگەر زۆریان لێکردیت تا هاوەڵ و هاوبەشـم بۆ بڕیار بدەیت! بێ ئەوەی زانسـت و زانیاریت هەبێت دەربارەی، ئەوە ملکەچیان مەبە و بەگوێیان مەکە، دڵنیاش بن کە گەڕانەوەتـان بۆ لای منە، ئا ئەو کاتە ئاگادارتـان دەکەمەوە لەو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا،جا ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کار و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، ئەوە بێگومـان دەیانخەینەڕیزی چاکەکارانەوە، ئەی بەندەیانێکم کە باوەڕتان هێناوە، بێگومان زەویی من پان و فراوانە، کەواتە هەر من بپەرستن.

هەموو کەســـێك دەبێت مردن بچێژێت،کەی، لە کوێ، بەچی،خودا نەبێت، کەس نایزانێت.

لەوەودوا تەنیا بۆ لای دەبرێنەوە،سوێند بەخودا،ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، لە کۆشـــکە بەرزەکانی بەهەشـتدا نیشـتەجێیان دەکەین، کە ڕووبارەکانبێبڕانەوەبەژێریاندا دێن و دەچن و تیایدا دەمێننەوە، ئای چەند چاکە پاداشتی چاکەکاران".

●له سورەتی(لقمان)دا، دەفەرموێ:﴿ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْأَخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾ ﴾

واتە: "ئەوانەیکە نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجام دەدەن، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەردەکەن، دڵنیاش دەبن بەهاتنەدیڕۆژی قیامەت،خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن، ئا ئەوانە لەسەر هیدایەت و ڕێبازی پەروەردگاریانن، ئا ئەوانەشن ڕزگار و سەرفراز".

●له سورەتی(الأحزاب)دا، دەفەرموێ:﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ ﴾

واتە: "بەردەوام مژدە بدە بە ئیمانداران، کە لەلایەنخوداوە ڕێزو قەدرێکی زۆریان هەیە".

●له سورەتی(المعارج)دا، دەفەرموێ:﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱلَّذِينَ فِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿٢٥﴾ وَٱلَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٢٦﴾ وَٱلَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٢٧﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴿٢٨﴾ ﴾

واتە: "بەڕاستیی ئینسان بە شپرزەیی و تەنگەتاوی دروستکراوە.

کاتێك ناخۆشـــیی تووش بوو، بێزارو دەم بە هاوارە،کاتێکیش خێرو بەرەکەتی تووش بوو، دەستی دەنوقێنێت و قەدەغەی چاکە دەکات.
تەنیا ئەو نوێژکەرانەنەبن، ئەوانەی کە لەسەر نوێژەکانیان بەردەوامن.
هەروەها ئەوانەش، کە بەشێکی دیاریکراو لە سامانیاندا هەیە، بۆ جیهاد وتێکۆشان، وە بۆ هەژاری داواکارو بێنەوای داوانەکەر، ئەوانەی کە باوەڕیڕاست و ڕەوان دەهێنن بە ڕۆژی پاداشت،ئەو کەسانەی کە دڵە لەرزەیان هەیە لە تۆڵەی پەروەردگاریان. بەڕاستیی سزای پەروەردگاریان کەس لێی ئەمین نابێت".

●لە سورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ:خُلِقَ يُبَصَّرُونَهُمْ ۚ يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَـٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِى تُـْٔوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُوا۟ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰٓ ﴿١٨﴾ ۞ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ٱلْإِنسَـٰنَ

واتە:"چەند پیتێك لە ســــەرەتای هەندێك لە ســــورەتەکانی قورئاندا هاتوون، ژمارەیان(١٤)پیتە، نیوەی کۆی پیتەکانی زمانی عەرەبین، بۆ ســــەلماندنی (اعجاز) و مەزنی و گرنگی قورئان، کە لە توانای هیچ کەسێکدا نییە بەو پیتانە کتێبێکی ئاوا بێ وێنە دابنێت، بەڕادەیەك، هەتا ئەگەر هەموو گرۆی ئادەمیزاد و پەریبۆ ئەو مەبەســـتە کۆببنەوە، بێگومان ناتوانن، هەروەها چەندەها نهێنی تریشـــی تێدایە، زاناکان لە هەندێکی دواون، بۆ هەندێکیشـــیان وتوویانە: هەرخودا خۆی زانایە بە نهێنی ئەو پیتانە.

ئەو قورئانە کتێبێکە، هیچ گومانێکی تێدا نییە، کە لە لایەنخودای پەروەردگارەوە ڕەوانەکراوە بە جبرائیلدا، بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، کە مایەیهیدایەت و سەرچاوەی هیدایەتە بۆخوداناسان و پارێزکاران،کە ئەوانەن فەرزەکان جێبەجێ دەکەن و لە ڕووی بیروباوەڕو کردارو گوفتارەوە،خۆیان لە حەرام دەپارێزن.

ئەوانەی باوەڕ بە نەبینراوەکان(غەیب)دەهێنن، وەك:خودا و فریشتە و ئەوانەیخودا باسی کردوون و ئێمە نایانبینین، هەروەها نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و لەو ڕزق و ڕۆزییە حەڵاڵەی پێمان بەخشیوون، دەبەخشن.

لە هەمان کاتدا، ئەوانە باوەڕ دەهێنن بەو پەیامەی کە بۆ تۆ ئەی محەمەد(ﷺ)دابەزێنراوە و بەو پەیامانەش کە بۆ پێغەمبەرانیپێش تۆش دابەزێنراوە (درودیخودایان لەسەر بێت)، دڵنیاش دەبن کە ڕۆژی دوایی (قیامەت)، هەربەرپا دەبێت.

ئەوانە لە سەر شارێگەی هیدایەتی پەروەردگاریانن و هەر ئەوانیشن سەرفراز و سەرکەوتوو، ئەمانە بنەما سەرەکیەکانی ئیمان و ئیسلامن".

●لە سورەتی(التوبة)دا، دەفەرموێ:﴿ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴿١٨﴾ ﴾

واتە: "بەڕاستییکەسێکمزگەوتەکانیخودا ئاوەدان دەکاتەوە، کەباوەڕی بەخودا و بە ڕۆژی دوایی هێنابێت و نوێژەکانی بەجێ هێنابێت و زەکاتی دابێت و جگە لەخودا،لەکەس نەترسابێت".

•لە سورەتی(الأنعام)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾

واتە: "ئەم قورئانە،کتێبێکی پیرۆزە، دامان بەزاندوە، ئەوە دەسەلمێنێت کە کتێبەکانی پێشوو ڕاستن، بە تایبەت تەورات و ئینجیل، کە ئەوانیش لە لایەنخوداوە ڕەوانەکراون، هەروەها ناردوومانە، تا شـــارە دێرینەکە (مەککەی پیرۆز)و، هەموو دەوروبەری داچڵەکێنێت و بانگیان بکات بۆ ئیسلام، کە دانیشتووانی هەموو گۆی زەوی دەگرێتەوە، جا ئەوانەی کە باوەڕ بەڕۆژی دوایی دەهێنن، باوەڕ بە قورئانیش دەهێنن و لەســەر نوێژەکانیان بەردەوامن و هەمیشــە لەکاتی خۆیدا ئەنجامی دەدەن و دەیپارێزن".

## ئایا عەقڵ پشتگیری ڕۆژی هەستانەوە دەكات؟

ئێستــــا كـاتی ئـەوە هـاتووە، دوای ئـەوەی تێڕوانینی(بـاوەڕداران) و (بێباوەڕان)مان خســـته ڕوو، لە دەرەوەی بازنەی(ئیمان)، پرســـیارێك لە خۆمان بكەین: ئاخۆ عەقڵ پشتگیری ڕۆژی هەستانەوە دەكات یان نا؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش، بەپێی ئەو بەڵگە و دەلیلە عەقڵییانەی كە لەبەر دەستمان هەن، بە دڵنیاییەوە دەڵێین بەلێ، عەقڵ پشتگیری ڕۆژی هەستانەوە دەكات، لەبەر ئەم بەڵگانەیخودارەوە:

### ١.هیچ دروستكراوێك بێ دروستكەر نییە:

هەر شتێك،دروستكرابێت، مسۆگەر دروستكەرێكی هەیە.

بۆیە ئەگەرئەم پرســـیارە لە هەر كەســـێك بكەین، تەنانەت ئەگەر ئەو كەســـە كەم عەقڵ(دەبەنگ)یش بێت، وە پێی بڵێین: ئایا فڕۆكە لەخۆڕا دروســت بووە، یان دروســتكراوە، بەدڵنیاییەوە دەڵێت: دروســتكراوە، چونكە عـەقڵ قبوولّی ئـەوە نـاكات،فڕۆكە بەو ڕێكوپێكییە و بەو هەموو بزوێنەر و باڵ و وایەر و پلاك و پارچە ئاســـن و برغۆ و تەختە و كورســـی و پەنجەرە و...تاد. بەبێ دروســـتكەر، واتە، بە ڕێكەوت(صـــدفة) دروســـت ببێت!

جا ئـەگەر فڕۆكەیەك، یان شـــەمەندەفەرێك، یان ئۆتۆمبێلێكی بچووك و...تاد. كە بە بەراورد بەم بوونەوەرە مەزن و بەرفراوانە، شتێكی زۆر كەم و بچووكە،لەخۆڕا دروست نەبووبێت، چ عەقڵێكی ساخلەم و تەندروست

قبووڵی ئەوە دەكات كەوا ئەم هەموو ئەستێرە و كەكەشان و هەسارەیە،هەروەها ڕۆژو هەیڤ بە ئاسمانەوە بەبێ ڕاگر، هەمدیس زەوی و ئەم چیا و شاخ و دەریا و زەریایانە و ئەم گژوگیا و داروبارانە، هەروەهائەم گیاندارە فرە جۆرانە لەخۆڕا و دروستبووبن و كەس دروستی‌نەكردبن؟

هەروەها خودی مرۆڤ، یەكێكە لە سەرسوڕهێنەرترین ئافرێندراوەكانی ئەم جیهانە پان و بەرینە، كە جەستەكەی، لە(مادده و ڕۆح) پێكهاتووە، سەرەتا ماددەكان دروست دەبن، ئینجا ڕۆح دەكرێت بە بەریدا، ئەمە لەلایەك، لەلایەكی دیكەوە، ئەگەر ئێمەی مرۆڤ،بە وردی سەرنج بدەینە لەشی خۆمان ولە یەكە یەكەی ئەندامەكانمان ڕامێنین، سەرما سوڕدەمێنێت، كەوا چۆن ئاوا بە جوانترین و باشترین شێوە دروستكراون، هەروەها هەر ئەندامێكیش لە ئەندامەكانی لەشی مرۆڤ ئەرك و فەرمانێك یان چەند ئەرك و فەرمانێكیان هەیە،هەر كامیان، ئاوا بە شێوەیەكیرێكوپێك و سیستماتیك،ئەرك و فەرمانەكانی خۆی جێبەجێ دەكات و بۆ ساتێكیش لە كاری خۆی دواناكەوێت و ناوەستێت؟!

لێرەدا،ناتوانین باسی گشت ئەندامانی جەستە بكەین، تەنیا بە كورتی ئاماژە بە ئەرك و فەرمانی سێ ئەندامانی جەستە دەكەین و بە نموونە دەهێنینەوە:

١. چاو: چاوی مرۆڤ لە تۆپێکی خڕی بچووک دەچێت و، دەکەوێتە لای پێشەوەی سەر، هەر چەند چاو لە قەبارەدا بچووکە، بەڵام یەکێکە لە گرنگترین و هەستیارترین ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، چونکە جگە لە جوانی،ڕۆشنایی و ڕووناکیش بە مرۆڤ دەبەخشێت و بەهۆی چاوەوەیە، مرۆڤ ئەم هەموو دیمەنە جوانانە دەبینێ و، ئەم هەموو ڕەنگە فرە جۆر و قەشەنگانە لێکجیادەکاتەوە و، ئەم هەموو سیما و ڕوخسارانە دەناسێتەوە، بۆیەش هەمیشە جێی سەرنج و لێکۆڵینەوەی توێژەران بووە.



هەڵبەت،چاویەکێکە لە مەزنترین نیعمەتەکانی خودا، کە بە مرۆڤی بەخشیوە، چونکە مرۆڤ بەبێ چاو، تام و چێژ لە خۆشییەکانی دنیا وەرناگرێ، بەڵکوهەمیشە، تەنانەت لە ڕۆژی ڕووناک و خۆرەتاویشدا، هەر لە شەوەزەنگ و تاریکیدا بەسەر دەبات و لە گرنگترین هەست

بێبەش دەبێت، کە هەســـتی دیتن و بینینە، بەڵام تا مرۆڤ چاوەکانی خۆی لە دەست نەدات، پەی بەم ڕاستییە حاشاهەڵنەگرە نابات!

لەمبارەیەوە، زانایان دەڵێن: چاوی مرۆڤ خاوەن توانایەکی ئێجگار زۆرە، چونکە دەتوانێ (١٠) ملیۆن ڕەنگی ناوێتەکراو و تێکەڵاو بناسێتەوە، هەروەها ئەو شــتانەی چاو دەیبینێـــــت، لە ماوەی (٠,٢) چرکەدا بۆ مێشــک دەیگوازێتەوە.

هەروەها چاوی مرۆڤ خاوەنی (١٠٧) ملیۆن خانەیە، کە هەستیارن بە ڕووناکی و ڕۆشنایی، (٧) ملیۆن لەو خانانە، بەرپرسن لە ڕەنگەکان، واتە، تەنیا ڕەنگەکان لە یەك جیادەکەنەوە، (١٠) ملیۆن خانەیدیکەش، تەنیا بەرپرسیارێتیان ئەوەیە، کە بتوانن لەشەو و تاریکیدا، شتەکان ببینن.

بە تێکڕا، مرۆڤ لە خولەکێکدا (١٧) جار و، لەکاتژمێرێکدا (١،٠٢٠) جار و، لە شــەو و ڕۆژێکدا (٢٤،٤٨٠) جار و لە مانگێکدا (٧٣٤،٤٠٠) و لە ساڵێکدا (٨،٨١٢،٨٠٠) ملیۆن جار، چاوەکانی خۆی دەترووکێنێت!

زانایان دەڵێن: چاو بە تەنیا، لە ٦٥% ی توانای مێشــک دەبات، لەکاتێکدا، بە هەموو ئەندامەکانی تری لەشــەوە، لە ٣٥% ی توانای مێشك دەبەن.

عەدەســەی چاوی مرۆڤ، (١٤٠٠٠) ماســولکەی پێویە، بۆ ئەوەی وێنە و ڕەنگی ڕسمەکان، بە جوانی و ڕێکوپێکی بیخاتە بەر دیدی ئێمە،

هەر بۆیەش تا ئێستا نەتوانراوە هیچ عەدەسەیەکی کامێرا دروست بکرێت،کە خێراییەکەی بگاتە خێراییعەدەسەی چاو.

هەروەها چاوی مرۆڤ، بۆ بینینی تەنەکان، دەتوانێ تا(٣٦٠) پلە خۆی بسوورێنێ، هەمدیس زانایان ئەوەیان پشتڕاستکردۆتەوە، کەوا هەردوو چاوەکان، هەماهەنگییەکی تەواویان پێکەوە هەیە، بۆ نموونە: ئەگەر یەکێکیان تەماشای لایەکی کرد، ئەویتریشیان سەیری ئەو لایە دەکات، نەك بە پێچەوانەوە.

بیلبیلەی چاوی مرۆڤ، هەڵگری سیستمێکی تایبەتە، کە لەڕێگەی دەمارەکانەوە، بەڕێژەی (١٣٠)ملیۆنڕووناکی وەردەگرێت.

چاوی مرۆڤ دەتوانێت(١٢٠-١٢٥) ڕەنگی جۆراوجۆری دیاریکراو لەیەکتری جیابکاتەوە.

هەروەها برژانگ و پێڵووی چاوی مرۆڤ، چاو لە تەپوتۆز و شتی نامۆ و ترسناك و مەترسیدار دەپارێزن، هەروەها برژانگ سێبەربۆ چاو دروست دەکات و لە تیشکیڕاستەوخۆی خۆر دەیپارێزێت و تیشکەکان دەشکێنێتەوە، پێڵووش ناهێڵێت چاو تووشی وشکبوونەوە بێت.

پێکهاتەکانی فرمێسکی شادی لەگەڵ فرمێسکی غەم جیاوازن.

لە فرمێسکەکانی مرۆڤدا، جۆرە ماددەیەك هەیە، کە دەتوانێتچەندین جۆرە بەکتریا و ڤایرۆس بکوژێت.

چاوەکان هەردەم لەسەرخۆ جووڵە دەکەن، ئەوەش بۆ ئەوەیە وێنەی جوان و ڕوون بگوازنەوە بۆ مێشك.

ئێستا کاتی ئەوەیە بپرسین:ئایا دەکرێت ئەم پارچە گۆشتە بچووکە،لە خۆڕا و بێ دروســـتکەر،ئاوا بە وردی و دەقیقیکار بکات و ڕووناکی بە مرۆڤ ببەخشـــێت و ڕەنگەکان لە یەك جیابکاتەوە و بە دەیان ئەرك و فەرمانی دیکە جێبەجێ بکات، کەچی هیچ دروستکراونکیشی نەبێت و بە ڕێکەوت دروست بووبێت؟!

هەڵبەت، ئەگەر مرۆڤ ژیر و خاوەن بیرێکی ڕۆشـــن و تەندروســـت بێت، پەی بەو ڕاستییە دەبات، کە خاڵقێکی هەیە، کە(الله)یە.

٢. دڵ: دڵی مرۆڤ، بە یەکێك لە گرنگترین ئەندامانی جەســـتە هەژمار دەکرێت، چونکە مرۆڤبۆ ســـاتێکیش ناتوانێ بەبێ دڵبژیت، بۆیە هەر کاتێ دڵی مرۆڤ لە کار کەوت، ژیانیشی کۆتایی دێت.

هەڵبەت، دڵی مرۆڤ پڕە لە نهێنی و شـــتی ســـەرسوڕهێنەر،چونکە دڵ بزوێنەری ژیانە و گرنگترین پێنوێنی تەندروستییە.





کێشـــی دڵ( ۲٥۰-۳۰۰) گرامە، ئەم پارچە گۆشـــتە،لە چەند ماسولکەیەك پێکهاتووە، کاریان پاڵنانی خوێنە بۆ بەشەکانی جەستە،واتە، بەردەوام ٤,٥ لیتر خوێن بە نێو جەســـتەدا هاتووچۆپێدەکات ولەڕێی خوێنەوە، ئۆکســـجین دەگەیەنێتە ســـەرجەم خانەکانی لەش، خانەکان ئۆکسـجین وەردەگرن بۆ سـووتاندن و دروسـتکردنی خۆراکەکەی، گازی کاربۆن و پاشـماوە ژەهراوییەکانیش هەر لەڕێی خوێنەوە دەبرێنەوە بۆ دڵ، ئەویش پاڵی پێوە دەنێت بەرەو ســـییەکان، تاکو خوێنەکە پاك ببێتەوە و لەڕێی هەناسەدانەوە، گازی کاربۆن بکرێتە دەرەوەی لەش.

تۆڕی گواســـتنەوەی خوێن بەنێو جەســـتەدا، واتە خوێنبەر و بۆڕییە خوێنەکـانیـدیکە، ئەگەر لەدواییەك هەموویـان بگەیەنرێن بەیەکتر، ئەوا درێژییەکەی دەگاتە سەد هەزار کیلۆمەتر!

دڵ بە تێکرا،ڕۆژانە(۱۰۰)هەزار جار لێدەدات، بەوەش ســـاڵانە(۳٦) ملیۆن جار لێدەدات. ئەگەر تەمەنی کەســـێك(۷۱)ســـاڵ بێت، ئەوە لە ماوەیەدا(۲,٥)ملیار جار لێدەدات.

دڵی مرۆڤ، خۆبەخۆ لێدانی کارەبایی تایبەت بە خۆی دروستدەکات، واتە بێ گوێدانە بەشـــەکانی دیکەی لەش، ئەو کاری خۆی دەکات، هەموو ئەوەی پێویستی پێیەتی تەنیا هەندێك ئۆکسجینە.

هەروەها لەگەڵ ئەوەی لەکاتی ئاسایی، لە هەر خولەکێکدا، پێنج لیتر خوێن بە جەستەدا دەسوڕێنێ، لەکاتی ئەنجامدانی ئەرکی قورس لەلایەن خاوەنەکەیەوە، دەتوانێت ئەو بڕە زیاد بکات بۆ(۲۰) لیتر.

هەروەها ئەمەی لەبارەی دڵەوە باسکرا، مشتێك بوو لە خەروارێك! ئایا چ عەقڵێك قبووڵی ئەوە دەكات، ئەم پارچە گۆشتە، لە خۆڕا دروست بووبێت و ئاوا بە سیستماتیك و ڕێكوپێك كاری خۆی بكات، بەبێ ئەوەی بۆ ساتێكیش لە كار بوەستێت، تەنانەت لە كاتی خەوتنیشدا كاری خۆی دەكات!کەچی هیچ بەدیهێنەرێكیشی نەبێت و كەس دروستی نەكردبێت و بە فەرمانی كەس كارەكانی خۆی نەكات؟!

٣. **گەدە:** گەدە بەشێكی گرنگە لە کۆئەندامی هەرس، لە سێ چینی جیاواز پێكهاتووە، كە بریتین لە:چینی دەرەكی، چینی ماسوولكەیی، چینی دەردانی لینجی.

ناوبراو، لە توورەكە دەچێت، بە بەشی خوارەوەی سورێنچكەوە بەندە.

ئەركی گەدە، بە شێوەیەكی گشتی، هەرسكردنی خۆراكە بۆ شلە، دواتر دەینێرێت بۆڕیخۆڵەكان.





گەدە هەرسـی میکانیکی ئەنجام دەدات، ئەمەش بە گۆشـینی خۆراک، بەیارمەتیی گرژبوونی ماسـولکەکانی، وە لە کاتی ئەم گۆشینە، ڕژێنە زۆر بچووکەکانی دیواری گەدە ئەنزیمەکان و ترشێک بەرهەمدەهێنن، هەردوو دەردراوەکان بەیەکەوە کاردەکەن لە هەڵوەشاندنی خۆراک بۆ پارچەی زۆر بچووک، وە ترشـەکەش زۆربەی ئەو بەکتریایانە دەکوژێت، کە لەوانەیە لەگەڵ خۆراک قوت درابن. دوای چەند کاتژمێرێک،لە هەرسـی میکانیکی و کیمیایی، کە بەسـەر خۆراکدادێت، خۆراکە ماددەکە دەگۆڕێت بۆ تێکەڵەیەکی خەسـت پێی دەڵێن(کیمۆس).

هەڵبەت، ئەرك و فەرمانی سـەرەکیی گەدە، بریتییە لە هەرسـکردنی خۆراك، ئەم دەزگـایە، خۆی لە خۆیدا لە گۆشـت دروسـتکراوە، کەچیبەدرێژایی تەمەنیخۆی،هەڵدەسـتێت بە هەرسـکردنی مـاددە خۆراکییەکان، لەوانەش گۆشـت و خۆراکە قورسـەکان! بەبێ ئەوەیخۆی هەرس بکات! سـەیر ئەوەیە، ئەم پارچە گۆشتە، دەتوانێ بە دەیان سـاڵ، ئەرك و فەرمانەکانی خۆی جێبەجێ دەکات،بەبێئەوەی لە کار بکەوێت.

تۆ بڵێی ئەم پارچە گۆشـتە، لەخۆڕا دروسـت بوبێت و ئەم فەرمانە هەسـتیار و گرنگانە جێبەجێ بکات، بەبێ ئەوەی خالق و بەدیهێنەرێکی هەبێت؟!

هەڵبەت، ئەمانە بۆ کەسانی ژیر و ڕۆشـنبیر، هەموو بەڵگەن، لەسـەر ئەوەی مرۆڤ بەدیهێنەرێکی زانا و دانا و بەتوانای هەیە،کە(الله)ە.

### ٢. بۆ چەسپاندنی دادپەروەریی خودا:

کاتێ باوەڕمان بەوە هێنا کەخودایەك هەیە، ئەم هەموو بوونەوەری لە نەبوونەوە هێناوەتە بوونەوە وزانا و بە ئاگاشە بە هەموو شتێك، بەهێز و دەسەڵاتیشە، بەسەر هەموو شتێکدا، ئینجا پرسیارێکی دیکە دێتە ئاراوە: ئاخۆ دەبێخودا ئەم هەموو بوونەوەرەی بێهوودەو لەخۆڕا دروستی کردبێت و هیچ مرازو مەبەستێکی نەبووبێت لە ئافراندنیدا؟

ئایاخودایەك، هێندە زاڵدەست و باڵادەست بێت و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا بشکێت و هێندە زانا و دانا و بە توانا بێت، مەعقوڵە هیچ مەبەستێکی لە بەدیهێنانی ئەم بوونەوەرەدا نەبووبێت؟

دیسان لێرەدا،ژیرەکان و ئەوانەی بە ئاراستەیەکی ڕاست بیر دەکەنەوە، دەگەنە ئەو ڕاستییە، کە ئەمە لە خودا ناوەشێتەوە، چونکە یەکێك لە ناوە پیرۆزەکانیخودا، بریتییە لە(العدل)، بەڵام ئەگەر هەق و حیساب و پاداشت و سزا و دۆزەخ و بەهەشت نەبن، عەدالەت و دادپەروەری پەروەردگار دەچێتە ژێر پرسیارەوە، چونکە هەموومان بە چاوی سەر دەبینین: کەوا چۆن و بە چ شێوەیەکی دڕندانە، ملهوڕەکان و ستەمکارەکان، خوێنی خەڵك دەڕێژن و کەسیش لە دنیا پێیان ناڵێت پشتی چاوتان برۆیە!

بۆ نموونە، دیکتاتۆرێکی وەك هیتلەر لە جەنگی دووەمی جیهاندا،بەبێ غاڵ و غەرەز، بە دەیان ملیۆن کەسی کوشت، بەڵام لە کۆتاییدا یەك جار کوژرایەوە، ئایا کوژرانی ئەو هەموو کەسە، یەکسانە بە کوژرانی تاکە کەسێك؟ ئایا چ عەقڵێك ئەمە قبووڵ دەکات؟!

یان دیکتاتۆرێکی وەك سـەددام حسـێن، کاتێ لە چرکەسـاتێکدا زیاتر لە(٥٠٠٠)کوردی موسـڵمانی لە هەڵەبجە کیمیاباران و خەڵتانی خوێن کردن و کوشتنی! دواتر تەنیا یەك جار لە سێدارە درایە و گیانی دەرچوو و تەواو! ئەگەرخوداڕۆژێك دانەنێت بۆ دادگایکردنی ئەم سـتەمکارە،ئایا کێ هەقی ئەو(٥) هەزار کەسەی لێ دەسەنێتەوە؟ ئایا ئەگەر چاوپۆشی لە سـتەم و تاوانەکانی ئەو سـتەمکارە بکرێت، ئەو کاتە عەداڵەت و دادپەروەریخودا ناچێتە ژێر پرسـیارەوە؟! لە حاڵێکدا، خودای دڵۆڤان لە چەندین ئایەتدا باس لە دادپەروەری خۆی دەکات!

بۆ نموونە، لە سورەتی(ابراهیم)دا،دەفەرموێت:(وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعۡمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَۚ طر إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمۡ لِيَوۡمٖ تَشۡخَصُ فِيهِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ مُهۡطِعِينَ مُقۡنِعِي رُءُوسِهِمۡ لَا يَرۡتَدُّ إِلَيۡهِمۡ طَرۡفُهُمۡۖ وَأَفۡـِٔدَتُهُمۡ هَوَآءٞ).

واتە:"ئـەپێغـەمبـەر(ﷺ)، واگومـان مـەبـە کەخودا بێ ئـاگـایـە لـەو کاروکردەوەیەی سـتەمکاران دەیکەن، بەڕاسـتیی،خودا سـزاکەیان دوا دەخات بۆ ڕۆژێك، کە چاوەکانیـان تیایدا ئەبڵەق دەبن، جاری وایش هەیە هەر لە دنیادا ستەمکاران ڕیسوا دەکات و تۆڵەیان لێدەسێنێت.

بە پەلە و شپرزەییەوە دێن، سەریان بەرز کردۆتەوە و لە ترس و سامناکی ئەو ڕۆژەدا چاویـان نـاتروکێت، دڵەڕاوکێیـانەو دڵ و دەروونیـان بەتاڵە و هیچ حاڵی نین".

هەروەها لە سورەتی(غافر)، دەفەرموێ:(ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۚ لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡأٓزِفَةِ إِذِ ٱلۡقُلُوبُ

لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي ٱلصُّدُورُ وَٱللَّهُ يَقْضِي بِٱلْحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقْضُونَ بِشَيْءٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ).

واتە:"ئەمرۆهەمووکەس پاداشـــتی کارو کردەوەی خۆی وەردەگرێت، ئەمرۆ هیچ جۆرە ستەمێک لە کەس ناکرێت، بەڕاستییخودای گەورە بەخێرایی لێپرسینەوەکان ئەنجام دەدات، چونکە هەموو شتێك لای ڕوونە.

ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، بیانترســـێنە و ئاگایان بکە لە ڕۆژە نزیکەکە، ڕۆژی قیامەت، کاتێک کە دڵەکان دەگەنە گەروو، غەمگینی و پەژارە و تەنگانە دڵ ودەروونیخودانەناسان بەتەواوی داگیر ئەکات، هیچ دڵسۆز و پشتیوانێک بۆ ستەمکاران نییە، کەس تکاکار و غەمخۆریان نییە، تا قسەیەکی ڕەواجی هەبێت و تکای لێ وەربگیرێت.

ئەوخودایە هەمیشـە چاوە خیانەتکار و ناپاکەکان دەناسێت و دەزانێت چی لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشاردراوە".

هەمیشـــەخودا دادوەریی لەســـەر بنچینەی حەق و ڕاســـتیی ئەنجام دەدات، ئەوانەی جگە لەو زاتە هاواریان لێ دەکەن، هیچ دەســـەڵات و داوەرییەکیان لە دەســـت نایەت، بەڕاســـتیی هەرخودا خۆی بیســـەر و زانایە".

یان کەسێك، لە ژیاندا تەنیا کاری چاکەی کردبێت و کەسێکی دیکەش تەنیا کاری خراپەی کردبێت، کە هەردووکیان مردن، وەك یەك یەکسان دەبن لە پاداشت و سزادا، ئایا سزانەدانی خراپکار و پاداشتنەکردنی چاکەکار، دادپەروەری و دادگەری خودای مەزن ناخاتە ژێر پرسیارەوە؟!

خوای مەزن لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە دەداتەوە، لەوانە، لە سورەتی (الانبیاء)دا دەفەرموێ: (وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ).

واتە: "ئێمە پێوەر و تەرازووەکانی دادپەروەری لە ڕۆژی قیامەتدا دادەنێین، جا هیچ کەسێك بە هیچ شێوەیەک ستەمی لێ ناکرێت، ئەگەر بە قەدەر تۆوە خەرتەلەیەک، کە زۆر بچووک و وردە، کارێکی چاک یان خراپی ئەنجام دابێت، دەیهێنینە مەیدان، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە، کە ئاوا بە وردی حساب و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین".

● لە سورەتی (الأنعام)دا، دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعْلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ مِنْ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ۖ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ وَٱسْتَكْبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ

﴿٤١﴾ وَأَتْبَعْنَٰهُمْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلْمَقْبُوحِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾

واته:"مووســـا وتی: پەروەردگارم خۆی چاك دەزانێت كە كێ لەلایەن ئەوەوە بەرنامەی هیدایەتی هێناوە، سەرەنجامیش بەهەشت بۆ كێ دەبێت، بەڕاستیی ستەمكاران سەرفراز نابن. فیرعەون سەركەشانە وتی: ئەی خەڵكینە، من كەسـی تر شـك نابەم، كە شـایسـتەبێت بەوەیخوداتان بێت جگە لە خۆم! ئەی هامان، تۆ لە گڵ خشتی سوورەوەكراوم بۆ دروست بكە و قەڵایەكی بەرزو پتەوم بۆ بینا بكە، بەڵكو پیایدا ســـەربكەوم، تاخودایمووســـا ببینم، هەرچەندە من بەڕاســـتیی بڕوام وایە لە ڕیزی درۆزنەكاندایە!فیرعەون و سەربازان و دەست و پێوەندی بە ناحەق لەسەر زەویی(میسر)دا فیزیان كردو خۆیان بە گەورە زانی و گومانیان وابوو كە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە. سـەرەنجام ئێمە خۆی و سـەربازان و دەسـت و پێوەندیمان پێچایەوەو فڕێمان دانە ناو دەریاكەوە، سەرنج بدەو تەماشا بكەو بزانە: چۆن بوو ســەرئەنجامی ســتەمكاران، ئێمە ئەوانمان كرد بەچەند پێشەوایەك، كە بانگی خەڵكی دەكەن بۆ ناو ئاگر، لە ڕۆژی قیامەتیشدا سەركەوتوو نابن.

هەر لەم دنیادا نەفرینمان خستە شـوێنیان، لە ڕۆژی قیامەتیشـدا ئەوانە زۆر ئێسك تاڵ و ڕوخسار ناشیرینن".

●لە سورەتی(غافر)دا، دەفەرموێ:﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا

غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۚ قَالُوا۟ فَٱدْعُوا۟ ۗ وَمَا دُعَٰٓؤُا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ۖ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾

واته:"جاخودای گەورە، ئەو ئیمانداره ژیرەی پاراست لە پیلانی خراپ و دڕندانەیان، دارو دەستەی فیرعەونیش سزایەکی زۆر سەختیان تووش بوو، ئاگری دۆزەخە، بەیانیان و ئێواران، نیشانیان دەدرێت،یاخود پیایاندا دەچزێنرێت، لە جیهانی بەرزەخدا،ڕۆژی قیامەتیش فەرمان دەدرێت: ئادەی تاقم و دەستەی فیرعەون بخەنە ناو ئێش و ئازاری زۆر ناخۆشەوە.ئەو کاتە ئیتر شەڕو کێشە دەست پێدەکەن لەناو ئاگری دۆزەخدا، لاوازو چەوساوەکان، بەدەسەڵاتدارو لووت بەرزەکان دەڵێن: خۆ بەڕاستی ئێمە شوێنکەوتەی ئێوە بووین، ئایا ئێوە ناتوانن تۆزێک سزای ئاگرمان لەسەر کەم بکەنەوە؟لە وەڵامیاندالووت بەرزەکان دەڵێن: ئێمە هەموومان لەناو ئاگردا گیرمانخواردووە، بێگومانخودای گەورە داوەری

کردووه له نێوان بەندەکانیدا و بڕیارەکانی بڕاوەتەوە.ئینجا ئەوانەی که لەناو ئاگری دۆزەخدان، بە فریشـــتەکانی کارگێڕیی دۆزەخ دەڵێن: داوا له پەروەردگارتان بکەن؛ تەنها ڕۆژێک ســـزاو ئازارمان لەســـەر کەم بکاتەوە. ئەوانیش له وەڵامی داخوازییەکەیاندا دەڵێن: باشـــە، مەگەر پێغەمبەرەکانتان بە بەڵگەو نیشـانەیڕوون و ئاشـکراوە، ڕەوانە نەکرابوون بۆتان؟ هەمووان بەیەکدەنگ دەڵێن: بەڵێڕاستە، ئینجا فریشتەکان دەڵێن: دەی کەوابوو، هەر داوابکەن وبپاڕێنەوە، بێگومان داخوازی و پاڕانەوەی کافران بەهیچ ناچێت، تازە هیچ نرخێکی نییەو گیرا نابێت.

■ له سورەتی(الشوری)دا، دەفەرموێ:﴿ وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ ۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴿٤٥﴾ ﴾

واتە:"وە دەیان بینی پێشـــانی دۆزەخ دەدرێن بە ملکەچی و زەلیلی و داماوی بە گۆشـەی چاو، بە دزییەوە دەڕوانن، وە ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە دەڵێن: بەڕاســـتیی زیانبارەکان ئەوانەن، کە خۆیان و کەس و کاریان لە ڕۆژی هەســـتانەوەدا لە دەســـتداوە، بێدارین، بەڕاســـتیی ستەمکارەکان لە سزایەکی هەمیشەیی دان".

■ له سورەتی(الزمر)دا، دەفەرموێ:﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾

واتە:"خۆ ئەگەر بەڕاستیی ئەوانەی کەستەمیان کردووە، خاوەنی هەر هەموو زەویی بن، ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێت، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا هەر هەمووی دەکەنە قوربانی خۆیان و هەمووی دەبەخشن لە پێناویڕزگاریی خۆیاندا، کاتێک کە دەبینن سزاو ئازاری دۆزەخ زۆرسەختە و لەلایەنخوداوە، سزاو ئازار و ئەشکەنجەی وایان بۆ دەردەکەوێت، کە هەرگیز بە تەمای نەبوون".

■ له سورەتی(سبأ)دا، دەفەرموێ:﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓا۟ أَنَحْنُ صَدَدْنَـٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا

رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾

واتە:"ئەوانەی کە بێباوەڕن، دەڵێن: هەرگیز باوەڕ بەم قورئانەو بەو کتێبانەش ناکەین، کە پێش ئەم ڕەوانەکراوە، خۆ ئەگەر دەبینیلە ڕۆژی قیامەتدا، چۆن ستەمکاران وەستێنراون لەبەردەم دادگای پەروەردگاریاندا، قســە بە یەکتری دەڵێن ویەکتری تاوانبار دەکەن. لاوازکراوەکان، بە زۆردارو دەســەڵاتدارەکان دەڵێن: ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئێمە باوەڕدار دەبووین. دەســەڵاتدارو زۆردارەکانیش بەلاوازکراوو ژێردەستەکان دەڵێن: بۆچی ئێمەڕێگەی هیدایەتمان لێ‌بەستبوون و نەماندەهێشت دوای ئەوەی کە بۆتان هاتبوو بکەون؟! نا، وا نییە، خۆتان تاوانبارو تاوانکارن. دووبارە لاوازکراو ژێردەســتەکان، بە زۆردارو دەســەڵاتدارەکان دەڵێن: نا، وانییە، بەڵکو بە شەو و ڕۆژ، پیلان و نەخشەتان دادەنا بۆ ئەوەی فەرمانمان پێ بکەن، تاکو باوەڕمان بەخودا نەبێ وپەیڕەوی لەڕێبازەکەی نەکەین و شــوێن ڕێیەکەی نەکەوین، هەروەها هاوەڵ(شــەریك)ی بۆ بڕیار بدەین،پاشــان هەموان پەشــیمانی لە دەروونیاندا دەشــارنەوە، بەتایبەتی کاتێك، کە ئەو ســزاو تۆڵەیان بینی،کە بۆیان ئامادەیە، ئەوســا ئیدی کۆت و زنجیرمان کردە گەردەنی ئەوانەی کە بێباوەڕبوون، مەگەر پاداشتیان لەبری کارو کردوەکانیان نییە"؟!

●لە سورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ:﴿ إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ لَوْ

﴿ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا مِنَّا كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾ ﴾

واتە:"لەو كاتەدا سـزاپرۆژی دوایی دەبینن، ئەوانەی کە خەڵکی شـوێنیان کەوتبوون، خۆیان بەریی دەکەن و لە شـوێنکەوتەکانیان حاشـا دەکەن، بەتایبەت کاتێك ئەو سـزا توندوتیژە دەبینن، هەموو پەیوەندییەکان دەبچڕێت، کە لە نێوانیاندا هەبوو و هیچ بەڵگەوبیانوویەکیان بەدەسـتەوە نامێنێت، کە خۆیانی پێ رزگار بکەن. ئەوانەی کە شـوێنکەوتە بوون، دەڵێن: خۆزگە نۆرمیەکمان بۆ بلوایە، ئێمەش ئاوا خۆمان بەریی دەکرد لەوان، هەروەك ئەوان خۆیان بەریی کرد لە ئێمە، تا بەو شـێوەیەخودا سـەرئەنجامی کارو کردەوەکانیان نیشـان دەدات و بۆیان دەکاتە ئاخ و حەسرەت لەسەریان، بەڕاستیی ئەوانە هەرگیز لە دۆزەخ دەرناچن".

●هەر لە سـورەتی(البقرة)دا، دەفەرموێ:﴿ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾ ﴾

واتە:"جا ئەوانەی کە سـتەمیان کردووە، گەر دەیانزانی لە کاتێکدا کە بەچاوی خۆیانڕووبەڕووی ئەو سـزایە دەبنەوە، کە بەڕاسـتیی بۆیان دەردەکەوێت کە هێزو تواناو دەسـەڵات، هەر هەمووی بە دەسـتخودایە و دڵنیا دەبوون کە ئەوخودایە سزاکەی زۆر بە ئازارەبۆ ستەمکاران".

●لە سورەتی(الشوری)دا، دەفەرموێ:﴿ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴿٤٤﴾ ﴾

واتە:"وە ســــــتەمکارەکان دەبینی، کاتێ ســــــزایخودا دەبینن، دەڵێن ئایارێگەیەك هەیە بگەڕێینەوە بۆدنیا"؟!

•لـە ســــــورەتی(الزمر)دا، دەفـەرموێ:﴿ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّـٰلِمِينَ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾

واتە:"جا ئایا ئەو کەســـەی بە ڕوخســـارو دەم و چاوی، بەرگریی لە سزای سەختیرۆژی قیامەت بکات،وەك ئەوە وایە کە نەترسێت، ئەوسا بەو ستەمکارانە دەوترێت: دەی بچێژن سزای ئەوەی کە دەتانکرد".

•لە سورەتی(الکهف)دا، دەفەرموێ:﴿ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّـٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ ﴾

واتە:"بێگومان ئێمە دۆزەخێکمان ئامادە کردووە بۆ ســـتەمکاران، کە لە هەمولایەکەوە دەوریان دەدات و دیواری بڵێسەی ئابڵوقەی داون، خۆ ئەگەر هاوار بکەن لە ئازارو تینویەتیدا، ئەوە ئاو دەدرێن بە ئاوێکی گەرمی پیس و بۆن ناخۆش، کە وەکو خڵتەی کانزایی تواوە وایە، ئەوەندەش گەرمە، دەم و چاویان هەڵدەکوڕوزنێت و دەیبرژێنێت،ئایکە چەندخوداردنەوەیەکی تاڵ و ناخۆشـــە! چەندە جێگەوڕێگەیەکی پڕ لە ئازارە".

●له سورەتی(هود)دا، دەفەرموێ:﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾

واتە:"نەکەن مەیلی دڵتان لەگەڵ ئەوانەدا بێت، کە ستەمیان کردووە و لە خودا یاخیبوون، چونکە ئەو کاتە ئاگر دەتانسوتێنێت، کەسیش جگە لەخودا، پشتیوانتان نابێت، لەوەودوایشیارمەتیی نادرێن".

●له سورەتی(الأنبیاء)دا، دەفەرموێ:﴿ وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأْسَنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُواْ وَٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَىٰهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴿١٥﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ ﴾

واتە:"چەندەها شارو شارۆچکەمان کاول کرد، کە خەڵکەکەی ستەمکار بوون و بەدوایاندا گەلانی ترمان هێناوەتە مەیدانەوە. جا کاتێک ئەوخودانەناسانە هەستیان کردووە کە تۆڵە و سزای ئێمە بەرەو روویان هاتووە و نزیکەیەخەیان بگرێت، ئەوە دەستبەجێڕایان کردووە لێی و سەریان لێشێواوە.ئەوسا بە گاڵتەپێکردنەوە، پێیانوتراوە: ڕامەکەن و بگەڕێنەوە بۆ ئەو ڕابواردنە و بۆ ئەو ماڵ و حاڵەی کە تیایدا دەژیان،

بۆ ئەوەی پرس و ڕاتان پێبکرێت و کارێکیان ئیشـــێک چاوەڕێتان بکات.لەوسا بە دەم ڕاکردنەوە، دەیانوت: هاوار بۆ ئێمە، بەڕاستیی ئێمە ستەمکار بووین.جا بەردەوام هەر ئەوە قسەیانە، هەتا هەموویانمان درونە و خامۆش کرد.ئێمە ئاســـمان و زەوی، هەرچیش لە نێوانیاندایە بە گاڵتە(بێ مەبەست)، دروستمان نەکردووە".

●لە سورەتی(الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُوا۟ نَعَمْ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌۢ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾

واتە:"وە بەهەشـــتییەکانگازی دۆزەخییەکان دەکەن، بێگومان ئێمە ئەوەی کەپەروەردگارمان بەڵێنی پێداین، ڕاست بوو، پێی گەیشتین، جا ئایا ئێوەش، ئەوەی کە پەروەردگارتان بەڵێنی پێدان، ڕاســـت بوو، پێی گەیشـــتن؟ دەڵێن بەڵێ، پاشـــان جارچییەك جاڕی دا لە نێوانیاندا، کە نەفرینیخودا لەسەر ستەمکاران بێت".

## ٣. هەموو شـــتێک بە جووتخەڵقکراوە، نابێت تەنیا دنیا تاك بێت:

هەڵبەت، هەموو شـــتێك بە جووت خەڵقکراوە، وەك:(ژیـــان- مردن)،(شـــەو- ڕۆژ)،(خێر- شـــەڕ)، (نێر- مێ)، (ئیمان- کوفر)، (گەشـــبینی- ڕەشـــبینی)، (زەوی- ئاســـمان)، (ســـارد-گەرم)،(ڕەش- سپی)،(خۆش- ناخۆش)،(کەم- کۆ) و(ترش- شیرین)و...هتاد.

هەروەکخودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا، لە سـوورەتی(الذاریات)، دەفەرموێ:﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾

واتە:"لەهەموو شـتێک، ئێمە جووتمان دروسـت کردوە، لەجیهانی ئادەمیزادو گیاندارو ڕووەک و بێگیاندا، لەهەموو شـتێکی ماددی و مەعنەویدا، بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و پەندیلێ وەربگرن".

هەروەها لە سورەتی(یس)دا، دەفەرموێ:﴿ سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾

واتە:"پاکی و بێگەردیی بۆ ئەو زاتەی هەر هەموو بەدیهێنراوەکانی بەجووت دروسـتکردووە لەوەی لە زەویدا دەڕوێت، لە(خۆیان)یش، لەو شتانەش،کە نایزانن لە سەردەمی عیلم و زانستداڕوون بۆتەوە، کە هەموو بەدیهێنراوان،(ماددی و مەعنەوی)،جووتن".

هەروەها کاتێ حەزرەتی نووح(علیه السلام)، کەشتییەکی دروستکرد،خودای مەزن سرووش(وەحی)ی بۆ نارد و پێی فەرموو:﴿ فَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ أَنِ اصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ فَاسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ مِنْهُمْ وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾

واتە:"ئینجا ئێمەش ئاگادارمان کرد، کە کەشـتییەکە دروسـت بکە، لە ژێر چاودێری و نیگای ئێمەدا، جا هەر کاتێك فەرمانی ئێمە دەرچوو،

تەنوورەکە فوارەی کردو ئاوی لێدەرهات، ئەوە لە هەموو جۆرێك، (جووتێك)[٢]سوار بکە، هەروەها خاوو خێزانت، جگە لەوانەی کە پێشتر بڕیاری غەرقبوونیان لەسەر دراوە، جا دەربارەی ئەوانەی کە ستەمیان کردوباوەڕیان نەهێنا، لێم مەپاڕێرەوە، چونکە بە ڕاستیی ئەوانە هەموو نوقمکراون لە زریانەکەدا".

هەموو ئەم بەڵگانەش، ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کەوا هەروەك چۆن دنیا هەیە، دەبێ قیامەتیش هەبێت! بۆ ئەوەی عەداڵەت و دادگەریی‌خودا بچەسپێت و بەرپا ببێت.

## ٤. بەپێی بەڵگە زانستی و ئایینییەکان، هەر شتێک سەرەتای هەبێت، کۆتایشی هەیە:

هەڵبەت، هەر شتێکلە سەرەتاوە دروستکرابێت و هاتبێتە بوونەوە، ڕۆژێك دێت لەناو دەچێت و کۆتایی پێدێت.

لەمبارەیەوە، پرۆفیسۆری ئەمریکی(ئەندریا لیندی) و هاوسەرەکەی(ریناتا کاوش)، لە زانکۆی ستانفۆرد، لە بەشی زانستیی فیزیا، جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە دەکەنەوە و دەڵێن:"جیهان لە فراوانبوون

(٢) مەبەست لە جووت،(نێرێك و مێیەك)ە، خودای مەزن داوای لە حەزرەتی مووسا(علیە السلام)کردووە، کەوا لە هەر گیانەوەرێك، نێرێك و مێیەك لە کەشتییەکەیدا بار بکات، چونکە دوای ئەو تۆفانە، ئیدی هیچ گیانەوەرێك لەسەر زەویی نامێنێت،جگە لەو گیانەوەرانە نەبێت، کە سواری کەشتییەکە دەبن، جا کە کەشتییەکە لەسەر چیای جودی لەنگەری گرت، دەگوترێت چیای جودی دەکەوێتە باکووری کوردستان، جارێکی دیکە هەر نێرێك و مێیەك پێکەوە و سەر لە نوێ زاوزێ بکەنەوە و دووبارە ژیان لەسەر زەویی دەستپێبکاتەوە.(نووسەر)

ڕادەوەسـتێت، واتە، چیتر فراوان نابێت و لە ئایندەیەکی نزیکدا لە ناو دەچێت"!

هەروەها لێکۆڵەران دەڵێن:"تیۆری تازە ئاماژە بەوە دەکات کەوا:"وزەی شاراوە، یان تاریك، کە وزە بە گەردوون دەبەخشێت، پەیتا پەیتا هێزی خۆی لە دەسـتدەدات، تا وای لێ دێت، گەردوون هەرەس دێنێت و هەموو شـتێك دەکەوێتە تاریکییەوە".

خودای مەزن، لەبارەی کۆتایی هاتنی دنیا، لە قورئانی پیرۆزدا، لە سورەتی (الانبیاء)، دەفەرموێ:"يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ(١٠٤)".

واتە:"ڕۆژێک دێت، ئێمە ئاسـمان دەپێچینەوە، وەکو چۆن کتێبی کراوە دادەخرێت و دەپێچرێتەوە، هەروەک چۆن لە سـەرەتاوە دروسـتمانکرد، وەک ئەوسای خۆی لێ دەکەینەوە(بۆ ئەوەی سەر لەنوێ بە شێوەیەکی تر دروسـتی بکەینەوە)، جا ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە، بێگومان ئێمە ئەو کارە ئەنجام دەدەین".

هەروەها لە سورەتی (الروم)دا، دەفەرموێ:"ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ(١١)".

واتە:"هەر خودا خۆی دروستکراوان دەهێنێتە مەیدان و دوایی وەك خۆیان لێدەکاتەوە،(سەرەتا هەر ئەو دروستی کردوون و هەر ئەویش، دوای مردن دووبارە زیندوویان دەکاتەوە)، سـەرئەنجامیش هەر بۆ لای ئەو زاتە دەبرێنەوە".

## ٥- زیندووکردنەوە ئاسانترە لە بەدیهێنان:

هەمیشە بەرەی بێباوەڕان ئەو پرسیارەیان وروووژاندووە: ئاخۆ کە مرۆڤ مرد، دووبارە زیندوو دەکرێتەوە؟ بە واتایەکی دیکە، ئایاخودا دەتوانێ ئەم هەموو مرۆڤە زیندوو بکاتەوە و چۆن زیندووی دەکاتەوە؟

هەڵبەت،هەر کەسێکی ژیر و خاوەن بیر و ڕۆشنبیر بێت وکەمێکهزر بکاتەوە، دەزانێت کە دروستکردنەوەی شتێك، زۆر ئاسانترە لە بەدیهێنانی ئەو شتە لە نەبوونەوە.

ئەگەر پرسیارێکی سادە ئاراستەی بێباوەڕان بکەین و پێیان بڵێین: ئایا بۆ کۆمپانیایەکیدروستکردنی مۆبایل، وەك کۆمپانیای (سامسۆنگ) یان (ئەپڵ)، دروستکردنی مۆبایلێکئاسانترە، یان چاککردنەوەی ئەو مۆبایلە، کاتێ لە کار دەکەوێت؟

بێگومان، هەر کەسێك کەمێ عەقڵی هەبێ و درۆ لەگەڵ خۆی نەکات و خۆی نەخەڵەتێنێ و چەواشە نەکات، بە دڵنیاییەوە دەڵێت: چاککردنەوەکەی زۆر ئاسانترە و لە دروستکردنی!

بۆیەخودای گەورە لە قورئانی پیرۆز، لە سورەتی(الروم)دا،وەڵامی ئەم جۆرە کەسانە دەداتەوە و دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾

واتە: "خودا زاتێکە، بەدیهێنانی دەستپێکردووە، لە پاشان، دوای مردنی، دووبارە دروستی دەکاتەوە، ئەم دروستکردنەوەی دووەم، لایخودا ئاسانترە

هەر بۆ خودایە، سیفەتی هەرە بڵند لە ئاسمانەکان و زەویداو، هەر ئەوە زاڵی کاردروست".

هەروەها لە سورەتی(العکنبوت)دا، لەمبارەیەوە دەفەرموێ:"أَوَ لَمْ يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ(١٩-٢٠)".

واتە:"ئایا ئەوە سەرنجیان نەداوە چۆن خوا لە سەرەتاوە دروستکراوان بەدی دەهێنێت، پاشان دووبارەی دەکاتەوە، بێگومان ئەو شتانە بۆ خوا زۆر سادە و ئاسانە".

ئەی پێغەمبەر(ﷺ)،پێیان بڵێ:با بگەڕێن بە زەویدا، تەماشـــا بکەن و ســەرنج بدەن، چۆن ئەو زاتە دروســتکراوانی بەدیهێناوە، لەوەودواش هەر خوا سەر لەنوێ بەرپایان دەکاتەوە(بە شێوە شێوازێکی تر ئاسمانەکان و زەوی و ئێمەش دەهێنێتەوە کایە)، بەڕاســتیی خودا دەســەڵاتی بەســەر هەموو شتێکدا هەیە".

هەمدیس لە سورەتی(الإسراء)دا، دەفەرموێ:﴿ قُلْ كُونُوا۟ حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ فِى صُدُورِكُمْ ۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا ۖ قُلِ ٱلَّذِى فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ ۖ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴿٥١﴾ ﴾

واتە:"پێیان بڵێ: حەز دەکەن ببن بە بەرد، یان ئاســـن، کە هەردوو بە ڕواڵەت لەژیانەوە دوورن، ئەوکاتەش هەرخودا زیندووتان دەکاتەوە،

چونکەخودای گەورە هیچی لە دەست دەرناچێت، یان هەر شتێك و هەر دروستکراوێك کە زۆر سەخت و گرنگ و گەورەیە لە بیرو هۆشتاندا، ئەوسا ئەوانەبە سەرسامییەوە دەڵێن: دەی باشە، کێ زیندوومان دەکاتەوە؟ بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار بەدیهێناون، زۆر لای ئاسانە زیندووتان بکاتەوە، ئەوسا سەریان شۆڕدەکەنەوە بۆ لات و سەر بادەدەن و دەڵێن: ئەوە کەی زیندوو دەکرێینەوە؟ کەیقیامەت بەرپا دەبێت؟ پێیان بڵێ:دوور نییەو لەوانەیە بەم نزیکانەبەرپابیێت".

دیسان لە سورەتی(یس)دا، دەفەرموێ:﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾

واتە:"ئایا ئادەمی نەیزانیوە کە ئەومان لە نوتفەیەك دروستکردووە، کەچییەکسەر دەبێتە دوژمنێکی دیار، دەمەقاڵێکەرێکی ئاشکرایەو نموونەمان بۆ دێنێتەوە و بەدیهێنانی خۆی لە بیرچۆتەوە، ئەو بێ بڕوایە، دەڵێ: کێ ئێسکەکان زیندوو دەکاتەوە؟ لە کاتێکدا کە ڕزیون؟ ئەی

محەمەد (ﷺ)، بەڵێ: ئەو زاتە، زیندوویان دەکاتەوە، کە لە یەکەم جارەوە بەدیهێناون و ئەو بە هەموو دروستکراوێك زاناو ئاگایە. زاتێ کە لە درەختی سەوز ئاگری بۆ دروست کردوون، ئیتر ئێوە ئاگری پێ دەکەنەوە، ئایا زاتێ کە ئاسمانەکان و زەویی بەدیهێناوە، ناتوانێ وێنەیان دروست بکاتەوە؟ بەڵێدەتوانێ و هەر ئەویش دروستکەری زانایە.بەڕاستی کاریخودا ئەمەیە، هەر کاتێ بیەوێ شتێك بەدیبێنێ، پێی دەڵێ:ببە، دەستبەجێئەو شتە دەبێت.جا پاك و بێگەردی بۆ ئەوخودایەیە، کە موڵکایەتی هەموو شتێك بەدەست ئەوە و بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە".

هەروەها لە سورەتی(ق)دا، دەفەرموێ:﴿ أَفَعَيِينَا بِٱلْخَلْقِ ٱلْأَوَّلِ ۚ بَلْ هُمْ فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٥﴾ ﴾

واتە:"جا ئایا ئێمە لە دروستکردنییەکەم جاردا دەستەوستان بووین؟تا نەتوانین زیندووتان بکەینەوە؟! نەخێر وانییە، بەڵکو ئەوان لە گوماندان لە دروستبوونەوەیەکی سەر لە نوێ".

- لە سورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ:﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾

واتە:"ئایاگومانتان وادەبرد کە بە ڕاستیی ئێمە ئێوەمان بەبێ مەبەست دروستکردووەو ئێوە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە"؟!

- لە سورەتی(الجاثیة)دا دەفەرموێ:﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾

واته:"خواندناســـان دەیانوت: ژیان تەنیا ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگارو زەمانە کاریگەرن تیاماندا و دەمان مرێنن و هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەســـەر بنچینەی هیچ جۆرەزانســـت و زانیارییەك ئەوە بلێن، بەڵکو تەنها پشت بەگومان و دوودڵی دەبەستن".

# دەرئەنجام

دوای ئەوەی بەبەڵگە(نەقلی)و(عەقڵی)یەکان، تیشـــکمان خســـتە ســـەر بابەتی(ژیان و مردن و هەستانەوە) و، بە تێر و تەسەلی شەن و کەومان کرد، گەیشتینە ئەم دەرەنجامانەیخوارەوە:

- هەموو بەڵگە عەقڵی و نەقلییەکان ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە ئەم بوونەوەرە خالقێکی هەیە، کە (الله)یە، چونکە گەواهیدەری ئەو ڕاســـتییەن کە بە ســیســـتمێکی هێندە ورد و ڕێکوپێك و ڕێکخراو دروســت کراون، هیچ عەقڵ و لۆژیکێکی تەندروست ناسەلمێنێ کە لەخۆڕا دروست کرابن.
- خوای مـەزن، لـە ڕێگـەی پـەرتووکـە ئـاســـمـانییـەکـانی، لـە ناویشـــیاندا(قورئانی پیرۆز)، ئاگادارمان دەکاتەوە کەوا (مرۆڤ)ی بێهوودە دروست نەکردووە،بەڵکو بۆ ئەوەدروستی کردووە، تاخوداپەرستیٖ بکات! بۆیە ئەم دنیایەی کردۆتە شـــوێنی تاقیکردنەوە، تاکو لە ڕۆژی(قیامەت)، ئەنجامی تاقیکردنەوەکەیوەرگرێتەوە، کەواتە ئەوەی لە دنیا چاندوومانە، لە قیامەت دەدوورینەوە!
- خودای مـەزن، خاوەنی هـەموو ســـیفـەتێکی بەرزو باڵایە، لەوانەش ســـیفەتی(العدل)، بۆیـە شـــایانی ئەو زاتە نییە، کەوا بەبیٖ (مراقبة) و (محـاســـبـة)، مرۆڤ لـە دنیـا ڕەهـا بکـات، تـاکو گـەورەکـان، بچووکەکانبچـەوسێننەوە، بەهێزەکانیش، لاوازەکان لەناو ببەن و تەڕو وشـك پێکەوە بستووتێنن!

بەڵکو عەدالەتی‌خودایی، ئەوە دەخوازێ، هەقی ستەملێکراو لە ستەمکار بکاتەوەو مافی چەوسێنراو لە چەوسێنەر بسەنێتەوە و پاداشتی چاکەکار بداتەوەو تاونبارو تاوانکاریشسزا بدات.

بۆ ئەم مەبەستەش پێویست دەکات کەوا ڕۆژی قیامەت هەبێت، چونکە بەبێ هەبوونی ئەو ڕۆژە، مەحاڵە ئەو دادگەرییە لە دنیا بێتەدی.

• ئەگەر مرۆڤ فێل لە خۆی نەکات و خۆی هەڵنەخەڵەتێنێ، بایی ئەوە بەڵگەی عەقڵی و نەقلی لەبەر دەستیدا هەیە، کە چاکە لە خراپەو خێر لە شەڕو ڕاست لە چەوت‌وپاك لە پیس و جوان لە ناشیرین جیابکاتەوە.

▪ دنیا شوێنی ئەزموون و تاقیکردنەوەیە، بەڵام تاقیکردنەوەی دنیا، وەك تاقیکردنەوەی قوتابخانە نییە، تەنیا قوتابییەکان بگرێتەوە، بەڵکو هەموو کەسێکی عاقڵ و بالق، بەبێ هەڵاوێردن(إستثناء)، تیایدا بەشدار دەبێت و تاقی دەکرێتەوە، بەڵام ئەنجامەکانی، لە دنیا وەرناگرێتەوە، بەڵکو لە ڕۆژی هەستانەوە(قیامەت)، پرسیاری لەبارەی ئەو کارانەی لێ دەکرێت، کە لە دنیا ئەنجامی داون، ئاخۆ لە دەرچووەکانە، یان لە دەرنەچووەکانە، لە براوەکانە، یان لە دۆڕاوەکانە، لە دۆزەخییەکانە یان لە بەهەشتییەکانە!

▪ ململانێی نێوان (مرۆڤ و شەیتان) و(هەق‌و باطل) و(ڕاست‌و چەوت) و (چاکەو خراپە) و(خێرو شەڕ)، لەو ڕۆژەوە هەبووە و دەستی پێکردووە کە بابەگەورەمان ئادەم(علیە السلام) ئافرێندراوە.

بۆیە ئەو ململانێیە، تا ڕۆژی قیامەت هەر دەمێنێت و بەردەوام دەبێت، جا کەسێك لەو ململانێیە سەردەکەوێت، کە بەندەیەکی ڕاستەقینەی‌خودا بێت‌ونەبێتە بەندەی‌شەیتانی پیس‌و نەگریس!

## سەرچاوەکان


- قورئانی پیرۆز
- تەفسیری ئاسان
- تەفسیری پوختەی قورئان
- تەفسیری ڕامان
- پوختەی سەحیحی موسلم، نووسینی پێشەوا زکی الدین عبد العظیم بن عبد القوی المنذری
- گۆڤاری هەیڤ
- ئەنتەرنێت

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا

- لە ساڵی(١٩٦٨)، لە گوندی پێندرۆ، لە بناری چیای بوتین، لە دەڤەری مزووری باڵا لە دایك بووە.
- لە ساڵی(١٩٨٧)، خانەی مامۆستایانی لە هەولێر تەواو کردووە.
- لە ساڵی (١٩٨٥)، دەستی بە نووسینی هەڵبەست کردووە و یەکەمین هەڵبەستی خۆی لە ساڵی(١٩٨٧)، لە گۆڤاری (بەیان)دا بڵاوکردۆتەوە.
- لە ساڵی(١٩٨٨)، دەستی بە نووسین کردووە و، تا ئێستا بە دەیان بابەتی فرە جۆری لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردستاندا بڵاوکردۆتەوە.
- یەکەمین پەرتووکی خۆی لە ساڵی(٢٠٠٣)بە چاپ گەیاندووە.
- تا ئێستا(٥٠) پەرتووکی چاپکراوی هەیە، لە بوارەکانی پەروەردە و فێرکردن و ئایین و ئەدەب و فەرهەنگ و زمان و ڕۆشنبیری گشتیدا.
- ئەندامی کارای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانە، لقی هەولێر.
- ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردە، لقی هەولێر.

• وەك ڕێزگرتنێك لە كار و بەرهەمەكانی نووسەر، ئەم بەڕێزانەی خوارەوە، ڕێز و سوپاسیان پێ بەخشیوە:

١.سەرۆكی حكوومەتی هەرێمی كوردستان، بەڕێز(نێچیرڤان بارزانی)، سێ جار.

٢.جێگری سەرۆكی پەرلەمان، بەڕێز د. جەعفەر ئێمینكی.

٣.وەزیری پەروەردەی پێشووتر، بەڕێز(د. عصمت خالد).

٤.وەزیری پەروەردەی پێشووتر، بەڕێز(سەفین دزەیی).

٥.وەزیری پەروەردەی كابینەی ئێستا، بەڕێز(د. پشتیوان صادق).

٦.سەرۆكی ئەنجوومەنی پارێزگای هەولێر، بەڕێز(د. عەلی ڕەشید).

## سوپاس و پێزانین

پڕ بە دڵ،ســـوپاس و پێزانینی خۆم ئاراســـتەی ئەو بەڕێزانە دەکەم، کە هاریکار و یارمەتیدەرم بوون، بۆ بەچاپگەیاندنی ئەم پەرتووکە. خوا خێریان بنووسێت و نموونەیان زۆر بێت.